# أَخلَاقِ حَمَلَةِ القُرآنِ

لِلإِمَامِ أَبِي بَكرٍ مُحَمَّدُ
بنِ الحُسَينِ بنِ عَبدِاللهِ الآجُرِّي
(ت٣٦٠هـ)

## بە کوردی

وەرگێڕانی: ئاری الأثري



## کورتەیەک لە ژیاننامەی ئەم ئیمامە بەڕێزە:

ناوی: محمدی کوڕی حسینی کوری عبداللەیە.

کونیەکەی: أبو بكر

ناسراوە بە: الآجري

ساڵی وەفاتی: ٣٦٠ھ

ماموستاکانی:

١- ابراهيم بن موسى ، ابو اسحاق الجوزى التوزى ٣٠٣ھ

٢- احمد بن الحسين بن عبدالجبار، ابو عبدالله الصوفى البغدادى ٣٠٦ھ

٣- جعفر بن محمد بن الحسين ، ابو بكر الفريابى ٣٠١ھ

٤- عبدالله بن العباس ، ابو محمد الطيالسى ٣٠٨ھ ( وە زۆرێکی دیکە )

قوتابیەکانی:

١- احمد بن عبدالله ، ابو نعيم الاصبهانى ٤٣٠ھ خاوەنی ( حلية الأولياء )

٢- على بن محمد بن عبدالله بن بشران ، ابو الحسن الاموى مولاهم البغدادى ٤١٥ھ

٣- ابو محمد عبدالرحمن بن عمر النحاس التجيبى المالكى البزار ٤١٦هـ

( وه زۆرێكى دیكەش )

وه هەندێک له بەرهەمەکانی :

كتاب ( الشريعه )

كتاب ( الغرباء )

كتاب ( اخلاق العلماء )

كتاب ( فرض طلب العلم )

كتاب ( قيام اللين والتهجد )

كتاب ( اداب النفوس )

كتاب ( تحرير النرد والشطرنج والملاهى )

كتاب ( ذم اللواط )

كتاب ( الفتن )

كتاب ( التفرد والعزله )

كتاب ( حسن الخلق )

وه زۆرێكى دیكه

أخبرنا الشيخان الصالحان الثقات: الشيخ تاج الدين أبو العباس أحمد بن علي بن أبي الفضائل العكبري الفقيه الشافعي ، والشيخ كمال الدين أبو حفص عمر بن محمد بن محمد بن حسين سبط الشى الإمام العالم الحافظ أبي محمد عبد الرحيم بن محمد بن الزجاج قراءة عليهما وأنا اسمع في يوم الجمعة السادس عشر من شهر ربيع الآخر من سنة ثلاث و ثلاثين و سبعمائة في مسجد السلامي بدار الخليفة شرقي بغداد.

قيل لهما: أخبركما الشيخ الإمام العالم مجد الدين أبو الفضل عبد الله بن محمود بن موفود بن محمود بن بلدجي إجازة فأقر به.

قالا: أخبرنا الشيخ الإمام الزاهد الصالح أبو بكر مسمار بن عمر بن محمد بن العويس النيار المقرى البغدادي سماعا لجميعه ، قال : أخبرنا أبو الفضل محمد بن ناصر بن محمد بن علي الحافظ ، قال : أخبرنا أبو بكر أحمد بن علي الطريثيثي ، قال : أخبرنا أبو الحسن علي بن أحمد بن عمر بن حفص الحمامي رحمه الله عليه ، قال:

أبو بكر محمدى كورى الحسينى كورى عبدالله الآجري ( رحمه الله ) دەفەرمووێ:

شایستەترین وتە بەوەی کە دەستی پێبکەین:

سوپاس و ستیاش بۆ سەرگەورەی بەخشندە ، وە باشترین سوپاسگوزاری ئەوەیە کە بەخشندە خۆی سوپاسی زاتی خۆی پێ کردوە ، ئێمەیش سوپاسی پێدەکەین : ( سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ( ١ ) وَآتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ وَجَعَلْنَاهُ هُدًى لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ أَلاَّ تَتَّخِذُواْ

مِن دُونِي وَكِيلاً ( ٢ ) ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ إِنَّهُ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا( ٣ ) ( الإسراء : ١ - ٢ - ٣ ) ،

( واتا : پاکی بۆ الله کە شەورەوی کرد بە بەندەکەی خۆی کە محمدە ( ﷺ ) لە ( المسجد الحرام ) لە کەعبەی پیرۆزەوە بۆ ( مسجد الاقصى ) لە ( بيت المقدس ) کە دەوروبەریمان پر خێر و بەرەکەت کردوە بە بەروبوم و ئاوو دابەزینی وەحی و ناردنی پێغەمبەران و شوێنی پیاوچاکان بۆیە شەورەویمان بەو بەندەیەی خۆمان کردتا هەندێک لە موعجیزەو ئایەتە سەرسورهێنەرەکانی خۆمانی نیشان بدەین وە بەدڵنیاییەوە الله بیسەر و بینەرە ، وە ئێمە تەوراتمان بە موسی( علیه سلام ) بەخشیوە کە لە کاتی خۆی هیدایەت بووە بۆ بەنی ئیسرائیل ئەوانەی کە بە راستی شوێنی بکەوتنایە جگە لە من پشت بە کەس مەبەستن و کارەکانتان بە کەسی تر مەسپێرن ، وە ئەی نەوەی ئەو کەسانەی کە لەگەڵ نوحدا ( علیه سلام ) لە کەشتیەکدا هەڵمان گردن وە رزگارمان کرد ئێوەیش وەکو نوح ( علیه سلام ) بن کە عەبدێک بووە شوکرانە بژێری اللهی کردوە )

وە ( الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَلَهُ الْحَمْدُ فِي الْآخِرَةِ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ ( ١ ) يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ الرَّحِيمُ الْغَفُورُ( ٢ ) ( سبأ : ١ - ٢ )

( واتا : حەمد و سەنا و ستایش بۆ الله ئەو خوایەی کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویەکانە هەمووی موڵکی ئەوە و لە ژێر دەسەڵاتی ئەودایە وە لە رۆژی قیامەتیشدا برواداران هەر حەمد و سەنا و ستایشی الله دەکەن کاتێک دەچنە بەهەشتەوە وە ئەو زۆر کاربەجێ و دانایە ، وە زانیاری هەیە دەربارەی هەموو ئەو دلۆپە بارانانەی کە دەچێتە ناو زەویەوە ، وە بە

ژمارەی ئەو مردوانەی کە دەخرێنە نا زەویەوە وە زانیاری هەیە بە ژمارە و چۆنیەتی و سیفاتی هەموو ئەو رووەک و دانەوێلانەی کە لە زەوی دەرەچێت وە زانیاری هەیە بە ژمارە و چۆنیەتی هەموو ئەو بەفر و باران و تەرزانەی کە لە ئاسمانەوە دادەبەزێت وە ئەوەی کە بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان لەو فریشتانەو کردەوەی بەندەکان وە الله بەرەحم و بەزەییە بە بەندەکانی و لێخۆشبووە بە تاوانەکانیان )

شوکری الله دەکەم لەسەر ئەو چاکانەی کە لەگەڵماندا کردویەتی هەر لە کۆنەوە ، وە نیعنەتە یەک لەدوای یەکەکانی ، سوپاسگوزاری کردوە ئەوەی کە دەزانێت کە سەرمەشق و گەورەیی بەخشندەی خۆی شتانێکی فێرکردوە کە نەیزانیوە ( واتا فێری بەندەکانی کردوە کە پێشتر نەیانزانیوە ) ، وە چاکەی الله بەسەریانەوە زۆرە ، وە داوای زیاتر دەکەم لە بەخششەکان و چاکەکان ، وە سوپاسگوزاری لەسەر ئەو نیعمەتانەی کە پێشکەشمانی کردوە ، بەراستی الله خاوەن بەخشش و چاکەی زۆرە ، وە سەڵاواتی الله لەسەر محمد کە بەندەیەتی و نێردراو پەیامنێر و دەسپاکە بەسەر گەیاندنی وەحیدا و بەندایەتیدا ، سەڵاواتێک لەسەری دەبێتە مایەی رەزامەندی ( واتا رەزامەندی الله ) ، وە بۆ ئێمەیش دەبێتە مایەی لێخۆشبون ، وە لەسەر کەسوکارەکانی هەموویان ، سەلامێکی زۆری چاک .

پاشان

١- من دەڵێم : متمانەم بە الله زیاترە لەوەی تەوفیقم پێببەخشێت لە پێکان ، لە وتە و کردار ، هیچ هێزێک نیە تەنها هێزی اللەی پایەبەرز و گەورە نەبێت،

وتم : الله قورئانی دابەزاندوەتە سەر پێغەمبەرەکەی ، وە فێری بەخشش و چاکەی کردوە کە پێشتر بۆی دانەبەزێندراوە ، وە فێری دروستکراوەکانی کردوە لە کتێبەکەی لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی : وە قورئان پارێزەرە بۆ ئەو کەسەی کە دەستی پێوە گردوە ، وە رێنیشاندەرە بۆ کەسێک کە دەیەوێت هیدایەتی لێ وەربگرێت ، وە بێنیازکارە بۆ کەسێک کە بیەوێت بێنیاز بێت ، وە پارێزەرە لە ئاگر بۆ کەسێک کە دوای بکەوێت ، وە روناکیە بۆ کەسێک کە بیەوێت روناکی لێ وەربگرێت ، وە چارەسەرە بۆ ئەوەی کە لە سنگدایە ، وە هیدایەت و رەحمەتە بۆ ئیمانداران ، پاشان الله ئەمری کردوە بە دروستکراوەکان کە ئیمانی پێ بهێنن ، وە کردەوە بکەن به موحکەمەکانی ، حەلالەکانی بە حەلال بزانن ، وە حەرامەکانی بە حەرام بزانن ، وە ئیمان بهێنن بە موتەشابیهەکانی ، وە پەند وەربگرن لە نمونەکانی ( آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا ) ( ال عمران : ٧ )

( واتا : بروامان هێناوە بەوەی کە هەمووی لە پەروەردگارمانەوەیە )

پاشان بەڵێنی پێیان دا لەسەر خوێندەوەی و کارکردن پێی : بە ڕگار بوون لە ئاگر و چوونە بەهەشت ، پاشان الله داینا لەسەر دروستکراوەکانی ئەگەر ئەوان کتابەکەی الله یان خوێندەوە تێی ڕابمێنن و تێیبفکرن ، و بیری لێ بکەنەوە بەدڵیان و ئەگەر گوێیان لێبوو لە جگە لەخۆیانەوە گوێی بۆ بگرن بە باشترین گوێگرتن ، پاشان بەڵێنی پێدان لەسەر ئەم شتە بە پاداشتێکی زۆر ، سوپاس و ستایش بۆ الله ، پاشان عز وجل زانیاری دا بە دروستکراوەکانی کە هەرکەسێک قورئان بخوێنێت و بیەوێ بازرگانی پێوە بکات ، ئەوا ئەوەی بردوویەتیەوە بردنەوەیەکە لەدوای ئەوە هیچ بردنەوەیەک نیە ( واتا هیچ پاداشتێکی بۆ نییە ) ، وە الله قورئانی ناساندووە بە بەرەکەتی بازرگانی لە دونیا و قیامەت .

محمدی کوری الحسين ( واتا ئیمامی الاجری رحمه الله ) دەفەرمووێ :

هەموو ئەوەی باسم کردووەو باسم کرد ، ان شاء الله ڕوونی دەکەینەوە لە کتابی الله عزوجل ، وە لە سوننەتی پێغەمبەرەکەی ( ﷺ ) ، وە لە ووتەی هاوەڵەکانی ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُم ) ، وە زانایانی تر ، ئەوەی لەبیرمە و بەردەستە باسی دەکەم ان شاء الله ، وە الله موەفەقمان بکات بۆ ئەم کارە .

٢- الله عزوجل دەفەرمووێ : ( إِنَّ الَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَأَقَامُوا الصَّلاَةَ وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلانِيَةً يَرْجُونَ تِجَارَةً لَّن تَبُورَ ( ٢٩ ) لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِ إِنَّهُ غَفُورٌ شَكُورٌ ( ٣٠ ) ( فاطر : ٢٩ - ٣٠ )

( واتا : بەراستی ئەوانەی کە کتێبی الله دەخوێننەوە و بەچاکی نوێژیان بەجێهێناوە وە لەوەی کە پێمان داون لە نهێنی و ئاشکرا دەبەخشن چاوەڕوانی بازرگانیەکن کە هەرگیز زەرەر ناکات ، بۆ ئەوەی الله بە تێر و تەواوی پاداشتیان بداتەوە و لەبەهرەی خۆی زیاتریشیان پێبدات بەراستی الله لێبوردە و سوپاس وەرگرە )

وە الله عزوجل دەفەرمووێ : ( إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ( ٨ ) وَأَنَّ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ( ٩ ) ( الإسراء : ٨ - ٩ )

( واتا بەراستی ئەم قورئانە ڕێنموێنی دەکات بۆ ڕێباز و بەرنامەیەک کە ڕاستترینە وە موژدەیش دەدات بەو باوەردارانەی کە کردەوە چاکەکان دەکەن کە بەراستی پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە ، وە بەراستی ئەوانەی کە باوەڕیان نیە بە ڕۆژی دوای سزایەکی سەختمان بۆ ئامادە کردون )

وه الله عزوجل دەفەرمووێ : ( وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاء وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلاَ يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إَلاَّ خَسَارًا ) ( الإسراء : ٨٢ )

( واتا : وه لەم قورئانەدا دەینێرینە خوارەوە ئەوەی کە هۆی شیفا و رەحمەتە بۆ بڕواداران بەڵام بۆ ستەمکاران هیچ زیادناکات جگە لە خەسارەت مەندی )

وه الله عزوجل دەفەرمووێ : ( يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَاء لِّمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ) ( يونس : ٥٧ )

( واتا : ئەی خەڵکینە بێگومان بۆتان هاتووە ئامۆژگاری ( قورئان ) لەلایەن پەروەردگارتانەوە وە شیفا و چارەیە بۆ ئەوەی لە ناو دڵ و دەرونتان دایە وە رێنموێنی و میهرەبانیە بۆ بڕواداران )

وه الله عزوجل دەفەرمووێ : ( يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَكُم بُرْهَانٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَأَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا ( ١٧٤ ) فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُواْ بِاللَّهِ وَاعْتَصَمُواْ بِهِ فَسَيُدْخِلُهُمْ فِي رَحْمَةٍ مِّنْهُ وَفَضْلٍ وَيَهْدِيهِمْ إِلَيْهِ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ( ١٧٥ ) ( النساء : ١٧٤ - ١٧٥ )

( واتا : ئەی خەڵکینە بەراستی بۆتان هات بەڵگەی ئاشکرا لە پەروەردگارتانەوە وە ناردمانە خوارەوە بۆتان روناکیەکی ئاشکراکەر ( قورئان ) ، جا ئەوانەی بڕوایان بە الله هێناوە وە پشتیان بەو بەستوە ئەوە بێگومان دەیانخاتە ناو رەحمەتی خۆیەوە وە بەهرەو چاکەی خۆیەوە وە رێنمایمان دەکات بۆلای خۆی کە رێگای راستە )

وه الله عزوجل دەفەرمووێ : ( وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا ) ( العمران : ١٠٣ )

( واتا : هەمووتان دەست بگرن بە حەبلی اللهوە و جیا مەبنەوە ) حەبلی الله : قورئانە.

وە الله عزوجل دەفەرمووێ : ( اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُّتَشَابِهًا مَّثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ ذَلِكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَنْ يَشَاء وَمَن يُضْلِلْ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ ) ( الزمر : ٢٣ )

( واتا : الله جوانترین فەرمایشتی ناردوەتە خوارەوە قورئانێکە لەیەکچوی دوپات کراوەن وە ئەو کەسانەی لە پەروەردگاریان دەترسن پێستیان تەزوی پیادێت بە بیستنی قورئان پاشان پێستیان و دڵیان نەرم دەبێت بە یادی الله وە ڕێنموێنی اللهیە بەو قورئانە ڕێنموێنی هەرکەسێک دەکات کە بیەوێت وە هەرکەسێک الله گومرای بکات ئەوە ڕێنموێنی کەرێک بۆ ئەو نیە )

وە الله عزوجل دەفەرمووێ : ( كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِّيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُوا الأَلْبَابِ ) ( ص : ٢٩ )

( واتا : ئەم قورئانە کتێبێکی پیرۆزە ناردومانەتە خوارەوە بۆ تۆ بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە لە ئایەتەکانی وەخاوەنانی بیر و ژیری پەندی لێ وەربگرن )

وە الله عزوجل دەفەرمووێ ( وَكَذَلِكَ أَنزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ الْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا ) ( طه : ١١٣ )

( واتا : ئا بەو جۆرە قورئانێکی عەرەبیمان دابەزاندوە بە چەند جۆر و شێوازێک هەرەشەمان لەودا باسکردوە بۆ ئەوەی لە الله بترسن و خۆیان بپارێزن لە تاوان یا بیربکەنەوە و بێداری دروست ببێت بۆیان بەهۆی قورئانەوە )

٣- پاشان الله عزوجل پەیمانی داوە هەرکەس گوێ لە وتەکانی بگرێت ، لە کاتی گوێگردن با باشترین ئەدەب و جوانترین شێواز گوێی لێبگرێت ، وە واجبی بکات لەسەر خۆی کە دوای بکەوێت ، وە کرداری پێبکات ، وە موژدەی پێبدات بە هەموو خێرێک ، وە بەڵێنی پێداوە لەسەر باشترین پاداشت ، وە فەرموویەتی : ( وَالَّذِينَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوا إِلَى اللَّهِ لَهُمُ الْبُشْرَى فَبَشِّرْ عِبَادِ ( ١٧ ) الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ أُوْلَئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمُ اللَّهُ وَأُولَئِكَ هُمْ أُوْلُوا الأَلْبَابِ ( ١٨ ) ( الزمر : ١٧ - ١٨ )

( واتا : وە کەسانێ کە لە پەرستنی بت و هەموو پەرستراوێکی دیکە خۆیان پاراستووە وە گەڕاونەتەوە بۆلای الله موژدەی گەورە تەنها بۆ ئەوانە کەواتە موژدە بدە بە بەندەکانم ، ئەوانەی گوێ دەگرن بۆ وتە و پاشان شوێن چاکترینی ئەو قسانە دەکەون ئەوانە کەسانێکن کە الله ڕێنموێنی کردون و هەر ئەوانەن خاوەنانی ژیر و هۆش )

وە الله عزوجل دەفەرمووێ ( وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ ثُمَّ لا تُنصَرُونَ ) ( الزمر : ٥٤ ) تاکو ( مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لا تَشْعُرُونَ ) ( الزمر : ٥٥ )

( واتا : وە بگەڕێنەوە بۆلای پەروەردگارتان وە گەردن کەچی ئەو بن بەرلەوەی سزاتان بۆبێت پاشان یارمەتی نادرێن ) تاکو ئایەتی دواتر ( بەرلەوەی لەناکاو سزاتان بۆبێت کە ئێوە هەر هەستی پێنەکەن )

محمدی کوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ : هەموو وتەیەکی پەروەردگارمان چاکە بۆ هەرکەسێک کە بیخوێنێتەوە ، وە بۆ هەرکەسێک کە گوێی لێ بگرێت ، ئەمە الله زانترە پێی سیفەتی قەومێکە ئەگەر گوێیان

له قورئان بێت ئەوا دوای ئەو شتانە دەکەون لە قورئان کە لە اللهەوە نزیکیان دەکاتەوە ، ئەوەی کە سەرگەورەو بەخشندەیان پێیانی نیشان داوە ، بەوەیش داوای رەزامەندی الله دەکەن ، هەروەها ئومێدەواری رەحمەتین گوێیان لێبووە کە الله عزوجل دەفەرمووێ : ( وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُواْ لَهُ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ) ( الأعراف : ٢٠٤ )

( واتا : وە کاتێک قورئان خوێندرا دەبێ گوێی لێ بگرن وە بێدەنگیش بن بۆ ئەوەی الله رەحمتان لێ بکات )

وە باشترین گوێ گردنیان بۆ ئەم ئایەتە ئەوەبووە کە بیریانی خستوەتەوە لەو شتانەی کە بۆیانە و لەو شتانەی کە لەسەریانە ، وە گوێین لێبووە کە الله عزوجل فەرموویەتی : ( فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ) ( ق : ٤٥ )

( واتا : تۆ بەم قورئانە ئامۆژگاری ئەو کەسە بکە کە لە هەرەشەی من دەترسێت )

وە الله هەواڵی پێداوین لەبارەی جنەوە کە بەباشی گوێیان لە قورئان گردوە ، هەروەها چونە بەدەم ئەو شتانەی کە لەبارەیەوە الله ئاگاداریانی کردوەتەوە ، پاشان گەرانەتەوە بۆلای قەومەکەی خۆیان و ئامۆژگاریانیان کردوە بەوەی کە گوێیان لێ بووە ، الله عزوجل دەفەرمووێ : ( قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا ( ١ ) يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا ( ٢ ) ( الجن : ١ - ٢ )

( واتا : ئەی محمد بلێ نیگام بۆ کرا کە بێگومان چەند کەسێک لە جنۆکە گوێیان لێ گرد ( لەو قورئانەی کە خوێندم ) پاشان وتیان بەراستی ئێمە قورئانێکی سەرسورهێنەرمان بیست ، رێنموێنی دەکات بۆ رێی راست

ئێمەیش باوەڕمان پێ کردوە هەرگیز کەس ناکەین بە هاوبەشی پەروەردگارمان )

وە الله عزوجل دەفەرمووێ : ( وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنصِتُوا فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَى قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ( ٢٩ ) قَالُوا يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا كِتَابًا أُنزِلَ مِن بَعْدِ مُوسَى مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ وَإِلَى طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ( ٣٠ ) يَا قَوْمَنَا أَجِيبُوا دَاعِيَ اللَّهِ وَآمِنُوا بِهِ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ( ٣١ ) ( الأحقاف : ٢٩ - ٣٠ - ٣١ )

( واتا : وە بیریان بخەرەوە کاتێک چەند جنۆکەیەکمان نارد بۆلات تا گوێ لە قورئان بگرن جا کاتێ ئامادەی گوێ گردن بوون بە یەکیان وت : بێدەنگ بن و گوێ بگرن جا کە قورئان خوێندنەکە تەواو بوو هەموو گەڕانەوە بۆلای قەوم و هۆزەکانیان بەترسێنەر ، وتیان : ئەی هۆز و قەومەکەمان بەراستی ئێمە گوێبیستی کتێبێک بوین کە لە پاش موسا نێردراوەتە خوارەوە و پەراوەکانی پێش خۆی بەراست دادەنێت خەڵک ڕێنموێنی دەکات بۆ هەق و ڕێبازی ڕاست ، ئەی قەومەکەمان وەڵامی بانگەوازی الله بدەنەوە و باوەڕی پێبێنن الله لە تاوانەکانتان خۆش دەبێت و دەیسرێتەوە وە لە سزای سەخت دەتانپارێزێت )

محمدی کوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

٤- الله عزوجل دەفەرمووێ لە سورەتی ( ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ ) ( ق : ١ )

(واتا : قاف ماناکەی تەنها الله دەیزانێت ، سوێند بە قورئانی بەرز و بەرێز)

ئەوەی کە الله پێمانی نیشان داوە لەم ئایەتەدا لەبارەی دروستکراوەکانیەتی لەوەی کە دروستی کردوە لە ئاسمانەکان و زەوی و لەوەیشی لەنێوانیایەتی لە سەرسورهێنەری دانای لە دروستکردنی ، پاشان مردنی باس کردوە و باسی گەورەی کردوە لەبارەیەوە ، وە باسی گەورەی ئاگری کردوە لەبارەیەوە ، وە باسی بەهەشتی کردوە و چی ئامادە کردوە بۆ پیاوچاکانی ، پاشان الله عزوجل دەفەرمووێ : ( لَهُم مَّا يَشَاؤُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ ) ( : ٣٥ )

( واتا : لە بەهەشتدا هەرچیان بوێت بۆیان ئامادەیە وە لەوە زیاتریشمان هەیە ( کە بینینی اللەیە )

وە تاکو کۆتای ئایەتەکە ، پاشان لە دوای ئەوە دەفەرمووێ : ( إِنَّ فِي ذَلِكَ لَذِكْرَى لِمَن كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ) ( ق : ٣٧ )

( واتا : بێگومان لەم باسەدا پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسێک خاوەن دڵێکی زیندو بێت یان ژیربێت یان گوێ بگرێت ( بۆ قورئان ) وە بیریشی لایبێت )

الله جل ذکرە هەواڵی پێداوین کە پێویستە گوێگرد کاتێک بە گوێیەکانی دەبیستێت پێویستە بە دڵیشی ئەوە ببینێت کە دەیخوێنێتەوە و گوێی لێدەگرێت ، بۆ ئەوەی سود وەربگرێت لەو خوێندنەوەی قورئانە و گوێگردن بۆ ئەو قورئانەی کە بۆی دەخوێنن ، پاشان الله عزوجل دروستکراوەکانی هان داوە رابمێنن لە قورئان ، پاشان الله عزوجل دەفەرمووێ : ( أَفَلا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا ) ( محمد : ٢٤ )

( واتا : ئاخۆ ئەوانە ورد نابنەوە لە قورئان و تێیناگەن ؟! وانیە بەڵکو دڵیان قوفلی لێ دراوە )

وە اللّه عزوجل دەفەرمووێ : ( أَفَلاَ يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ اخْتِلافًا كَثِيرًا ) ( النساء : ٨٢ )

( واتا : ئەوە بۆ ئەوانە بیر لە قورئان ناکەنەوە خۆ ئەگەر لەلایەن کەسێکی ترەوە بوایە جگە لە اللّه  ئەوا بێ شک زۆرە دژبەیەکی و نارێکیان تێدا دەدۆزیەوە ).

محمدی کوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

٥- ئایا نابینن -رەحمەتی اللّه-تان لێبێت سەرمەشقی بەخشندەتان چۆن دروستکراوەکانی هان دەدات کە لە وتەکانی تێرابمێنن ، وە ئەوەی لە وتەکانی تێرابمێنێت ئەوا پەروەردگاری ناسیوە عزوجل ، وە دەسەڵاتی گەورە و قودرەت و هێزی ناسیوە ، هەروەها گەورەی ئەو چاکانەی کە رژاندویەتی بەسەر ئیمانداراندا ، وە ئەوەی زانیوە لەوەی کە فەرزە لەسەری لە عیبادات لەسەر خۆی واجب کردوە ، وە خۆی پاراستوە لەوەی کە اللّه ئاگاداری کردوەتەوە دەربارەی ، هەروەها ئەوەیش کە اللّه ویستویەتی ئەمیش ویستویەتی ، وە هەرکەس ئەمە سیفەتی بێت لە کاتی خوێندنەوەی بۆ قورئان ، وە کاتێک گوێی لێ دەگرێت ، لە کەسانێک جگە لەخۆی ، ئەوکات قورئان شیفایە بۆی و ئەوا دەوڵەمەند دەبێت بەبێ پارە ، هەروەها گەورەی پێدەبخشرێت بەبێ بونی هۆز ، وە ئەوەی لەبیر کردوە ئەو تەنیایەی کە توشی دەبێت لە کەسانێک لە جگە لەخۆیەوە ( واتا پێویستی بە کەس نیە ) ، وە تەنها خەمی ئەوە کە خوێندنەوەی ئەو سورەتەیە کاتێک دەیکاتەوە و کەی پەند وەربگرێت لەوەی کە

دەیخوێنێتەوە و مەبەستی ئەم ئەوە نیە کە کەی سورەتەکە تەواو بکات ، مەبەستی ئەم ئەوەیە کە کەی تێبگات لەو وتانەی کە الله عزوجل دەیڵێت ؟ کەی دەگەڕێمەوە ؟ کەی پەند وەردەگرم ؟ چونکە خوێندنەوەی بۆ قورئان عیبادەتە ، عیبادەتیش لە بێئاگایدا نابێت ، وە الله موەفەقمان بکات بۆ ئەوە.

٦- ابن مسعود ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ :

پەرش و بڵاوەی پێمەکەن وەکو پەرش و بڵاوەکردن لە کاتی خواردنی خورما ( واتا وەک چۆن کاتێک کۆمەڵێک خورما دێتە پێشت جوانەکان و نایابەکان هەڵدەبژێت ، لە قورئاندا وامەکە و وامەبە تەنها ئەو ئایەتانە مەخوێنن کە خۆتان بە دڵتانە و واز لەوانەی دیکە بهێنن ) ، وە وەکو شاعیرەکان مەیلەڕێننەوە ، لەسەر ئایەتە سەرسورمانەکان بوەستن ، دڵەکانی پێ بجوڵێنن ، وە نابێت خەمی هەریەکێکتان کۆتای سورەتەکە بێت ( واتا کەی بگاتە کۆتای سورەتەوە و تەواوی بکات و پەلەی تێدا بکات ) .

٧- حەسەنی بەصری ( رحمە الله ) دەفەرمووێ :

پابەند بن بە کتێبی اللهوە ، وە شوێنی ئەوانە بکەون کە تێیدایە لە نمونەکان ( وەکو نمونەی ئەو قەومانەی لە قورئاندا هاتووە وەک عیبرەتێک بۆ ئێمە ) ، وە لە قورئاندا بین بە ئەوانەی خاوەن بیناییین ، پاشان فەرمووی : ڕەحمەتی الله لە بەندەیەک نەفسی خۆی و کردەوەکانی لەگەڵ کتابی الله عزوجل بپێوێت جا گەر ( کردەوەکانی ) لەگەڵ کتابەکەی الله گونجا سوپاسی الله دەکات ، وە داوای زیاتر دەکات ، وە ئەگەر پێچەوانەی کتابی الله عزوجل بوو لۆمە و گلەیی لە نەفسی خۆی دەکات ، وە زوو دەگەڕێتەوە ( واتا زوو تەوبە دەکات ) .

٨- ابى كنانه ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

ابو موسى الأشعرى ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) قورئان خوێنەکان ( حافظ قورئانەکان ) ی کۆکردەوە کە نزیکەی سێ سەد کەس دەبوون ، پاشان قورئانی گەورە ڕاگرت ( واتا باسی کرد و وەسفی کرد ) , وە فەرمووی : بەڕاستی ئەم قورئانە تووێشوویەکە بۆ ئێوە , وە قورئان تاوانە لەسەرتان ( واتا تاوانە لەسەرتان ئەگەر تەنها پیتەکانی لەبەر بکەن و کردەوەکانتان پێچەوانەی قورئان بێت ) ، بۆیە دوای قورئان بکەون چونکە قورئان دوای ئێوە ناکەوێت ، چونکە هەر کەسێک شوێنی قورئان بکەوێت دەخرێتە باخەکانی بەهەشتەوە ، وە هەر کەسێک قورئان فرێبدات ( واتا نەیخوێنێت ) : ئەوا قورئان پاڵ بە پشتیەوە دەنێت و فڕێی دەداتە نێو ئاگرەوە .

٩- حەسەنی بەصری ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

هەرکەسێک حەز دەکات کە بزانێت خۆی کێیە ، ئەوا با نەفسی خۆی بە قورئان بپێوێت .

١٠- مجاهد ( رحمه الله ) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ( يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ ) ( البقره : ١٢١ )

( واتا قورئان دەخوێنن و دەوری دەکەنەوە )

دەفەرمووێ : کرداری پێدەکەن و حەقی کردارکردنەکەیشی پێدەدەن .

ڕونکردنەوە : ئەم تەفسیرە لە ابن عباس ، ابن مسعود ، عکرمه ، قتادە ، عطاء ، الحسن ، ابى رزین ، وە ابراهیمى النخعیشەوە هاتووە وە لە غەیری ئەمانەیش لە زانایانی سەلەف .

١١- عطاء ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

بەراستی قورئان عیبرەتە ، بەراستی قورئان عیبرەتە ( واتا پڕە لە پەند و عیبرەت بۆ خەڵک ) ( یاخود دەتوانیت بڵێیت کەسانێک دەکاتە پەند و عیبرەت بۆ خەڵکی بە باشە و دەیکاتە پێشەوا ، وە کەسانێکیش دەکاتە پەند و عیبرەت بۆ خەڵک بە خراپە ).

# باب ( ١ )

## فەزڵ و گەورەی هەڵگرانی قورئان

١٢- ئەنەسی کوری مالک ( رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

لەناو خەڵکیدا کۆمەڵە کەسانێک هەن ئەهلی اللّهن ، وتیان : کێن ئەوانە ئەی پێغەمبەر ( ﷺ ) ؟ ، فەرمووی : ئەوانە ئەهلی قورئانن ، ئەهلی الله و لە تایبەتەکانی اللّهن .

رونکردنەوە : ئەهلی قورئان ئەوانەن کە ئەلفاظەکانی فێر دەبن ، وە ئەحکامەکانی فێردەبن ، دواتر بەرجەستەی دەکەن لە ژیانی رۆژانەیاندا و کاری پێدەکەن والله اعلم .

١٣- بە سەنەدێکی دیکە ئەنەسی کوری مالک ( رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

لەلای الله دو ئەهل هەن ، وتیان : کێن ئەوانە ئەی پێغەمبەر ( ﷺ ) ؟ ، فەرمووی : ئەوانە ئەهلی قورئانن ، ئەهلی الله و لە تایبەتەکانی اللّهن .

١٤- عبداللّەی کوری عمرو ( رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

بە قورئان خوێن دەوترێت لە رۆژی قیامەتدا : بخوێنە ، بەرزبەرەوە لە پلەکان ( پلەی بەهەشت ) ، وە بخوێنە وەک چۆن لە دونیا دەتخوێند ،

چونكه مەنزلگەی ( شوێن ) تۆ لە بەهەشتدا ئەوكاتە كۆتای پێدێت كە دەگەیت بە كۆتا ئایەت كە دەیخوێنیتەوە .

١٥- بە سەنەدێكی دیكە عبداللهی كوری عمرو ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

بە قورئان خوێن دەوترێت لە رۆژی قیامەتدا : بخوێنە ، بەرزبەرەوە ( لە پلەكانی بەهەشت ) ، وە بخوێنە وەک چۆن لە دونیا دەتخوێند ، چونكە مەنزلگەی ( شوێن ) تۆ لە بەهەشتدا ئەوكاتە كۆتای پێدێت كە دەگەیت بە كۆتا ئایەت كە دەیخوێنیتەوە .

محمدی كوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

١٦- وە ریوایەت كراوە لە ام الدرداء ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) ، كە فەرموویەتی : پرسیارم لە عائیشە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) كرد دەربارەی كە كەسێک بڕواتە بەهەشت و قورئانی خوێندبێت ، فەزل و چاكەی چۆنە بەسەر كەسێكەوە كە نەیخوێندبێت ؟ ، عائیشە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) فەرمووی : پلەكانی بەهەشت بە گوێرەی ژمارەی ئایەتەكانی قورئانە ، هەركەسێک بڕواتە بەهەشتەوە و قورئانی خوێندبێت لەسەر ئەووە كەسێكی دیكە نیە .

رونكردنەوە : ئەم ئاثارە لە مصنف ابن ابی شیبە بە ژمارە ( ٣٠٥٧٢ ) هاتووە ضەعیفە .

١٧- ضعیف عبداللهی كوری مسعود ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

ئەم قورئانە فێری بن و بیخوێننەوە ، چونكە ئێوە پاداشتی لەسەر خوێندی وەردەگرن بە حەرفێک دە چاكە ، پاشان من نالێم ( الٓمٓ ) دە

چاکەیە ، بەڵکو دەڵێم : ( الألف ) دە چاکەیە ، وە ( اللام ) دە چاکەیە ، وە ( الميم ) دە چاکەیە ، چونکە بەراستی ئەم قورئانە ( مأدبة ) سفرەخوانی اللهیە ( سفرە خوان تەنها کەسە تایبەتەکانی بۆسەر بانگێشت دەکات ، ئەمە تەفسیرێکی وشەی مأدبە بوو ، وە زانایان تەفسیرێکی دیکەیان بۆ کردوە دەفەرموون : مرۆڤ والێدەکات لەوپەری ئەدەبدا بێت لەگەڵ الله ، وە لەگەڵ رەسولەکەی ، وە لەگەڵ دروستکراوەکانیشی ) ، فێربن لە سفرەخوانی ( قورئان ) الله بە گوێرەی تواناتان ، چونکە بەراستی ئەم قورئانە حەبلی اللهیە ، وە نوری رۆشناییەکی رونە ، وە شیفایەکی سودبەخشە ، رزگارکەری هەرکەسێکە کە دوای بکەوێت ، وە پارێزەرە بۆ ئەو کەسەی کە دەستی پێوە بگرێت ، لار و خێچ نیە و کەمو کوری تێدا نیە و راستە ، شتە سەرسورهێنەرەکانی کۆتایی پێ نایەت ، وە بەتاڵ نیە و پریەتی لە وەڵام دانەوە ( واتا بۆ گروپ و تاقمەکان )

رونکردنەوە : ئەم بەشەی کۆتای کە دەڵێت : شتە سەرسورهێنەرەکانی کۆتای پێ نایەت ، وە بەتاڵ نیە و پریەتی لە وەڵام دانەوە بە وتەی ئیمامی عەلیش هاتووە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ )

وە سەنەدەکە ابراهیمی الهجری تێدایە ضعیفە ( تهذيب الكمال ) ( ٢ / ٢١١ )

١٨- ابن مسعود ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ :

فێری قورئان ببن و بیخوێننەوە ، چونکە پاداشتی لەسەر وەردەگرن ، وە لە بەرامبەر هەر وشەیەکدا دە چاکەیە ، چونکە من ناڵێم ( الٓمٓ ) دە چاکەیە ، بەڵکو دەڵێم : ( الألف ) دە چاکەیە ، وە ( اللام ) دە چاکەیە ، وە ( میم ) دە چاکەیە .

رونكردنەوە : ئەم وتەیە بە صەحیحی لە سنن الترمذی هاتووە لە ابن مسعودەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەیگێڕێتەوە دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

هەرکەسێک حەرفێک لە قورئان بخوێنێت چاکەیەکی بۆ هەیە ، پاداشتی چاکەیەکیش ( لە قورئاندا ) یەک بە دەیە ، من ناڵێم ( الٓمٓ ) پیتێکە ، بەڵکو دەڵێم : ( الألف ) پیتێکە ، وە ( اللام ) پیتێکە ، وە ( میم ) پیتێکە .

١٩- عبداللّٰەی کوری عمرو کوری عاص ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ :

هەرکەسێک قورئان کۆبکاتەوە ( واتا حیفظی بکات ) ئەوە شتێکی گەورەی هەڵگردوە ، پێغەمبەرایەتی کراوە بە بەینی هەردو شانیەوە بەڵام وەحی بۆ نایەت ، نابێت ئەو کەسەی حافظ قورئانە تورەبونی وەکو تورەبونی کەسی دیکە وابێت ، توشی نەفامی و نەزانی نەبێت بەرامبەر کەسێک کە نەفامی و نەزانی بەرامبەر دەکات ، چونکە قورئان لە سینگیایەتی .

٢٠- منقطع لە مەکحولەوە لە ابی أمامە الباهلي ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرموویەتی :

هەرکەسێک روبعێک لە قورئان بخوێنێت ، ئەوە روبعێک لە پێغەمبەرایەتی پێدراوە ، وە هەرکەسێک سێیەکی قورئان بخوێنێت ، ئەوا سێیەکی پێغەمبەرایەتی پێدراوە ، وە هەرکەس سێ روبعی قورئان بخوێنێت ، ئەوا سێ روبعی پێغەمبەرایەتی پێدراوە ، وە هەرکەس قورئان هەمووی بخوێنێت ئەوا پێغەمبەرایەتی پێدراوە ، بەڵام وەحی بۆ دانەبەزیوە .

رونكردنەوە : ئەم فەرموودەیە ضەعیفە چونکە مکحول گوێی لە ابی أمامه ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) نەبووە ، الدارقطنی ( السنن ) ( ١ / ٣٢٦ )

بەڵام بە قسەی ابی أمامه ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) صەحیحە .

# باب ( ٢ )

# فەزلی ئەو کەسەی فێری قورئان دەبێت وە فێری خەڵکیشی دەکات

رونکردنەوەیەک دەربارەی بابەکە :

قورئان فێربون تەنها فێربونی خوێندنەوەکەی نیە بەڵکو فێربونی ئەحکامەکانیشیەتی

فێربونی قورئان لە کوێوە دەست پێدەکات ؟

یەکەم : فێری پیتەکانی بیت

دووەم : دواتر فێری کەلیمەکان بیت و بیدەیە پاڵ یەکەوە

سێیەم : فێری ماناکانی بیت

دوای ئەوەی ئەمانە فێربویت ئەوا دەتوانیت کۆمەڵێک تەلەبە بگریت و فێریان بکەیت ئەوە ئەوکات قورئان فێرەبیت و خەڵکیش فێرەکەیت .

٢١- لە ابی عبدالرحمانی السلمیەوە ، لە عوثمانی کوری عفانەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) ،

شعبە ( رحمە اللە ) دەفەرمووێ : پرسیارێکم لێ کرد لە پێغەمبەرەوە ( ﷺ ) ؟

عثمان ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) فەرمووی : بەڵێ ،

کە پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرموویەتی :

چاکترینتان ئەو کەسەیە کە خۆی فێر قورئان دەبێت و خەڵکیش فێردەکات .

عبدالرحمان دەفەرمووێ : ئەم حەدیثە وای لێ کردم و لە شوێنی خۆمی دانیشاندم ( واتا وای لێ کردم دەرس بدەمەوە ) ، دەرسی خەڵکی دایەوە لە خیلافەتی عثمانەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) تاکو دەسەڵاتی حەجاج .

٢٢- علی کوری ابی طالب ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

چاکترینتان ئەو کەسەیە کە خۆی فێری قورئان دەبێت و فێری خەڵکیش دەکات .

٢٣- لە مصعبی کوری سعدەوە ، لە باوکیەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

چاکترینتان ئەوەیە فێری قورئان دەبێت و فێری خەڵکیشی دەکات .

سعد ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) دەسمی راکێشاو داینیشاندم لە مەجلیسەکەدا بۆ ئەوەی بخوێنم ( واتا پێغەمبەر ( ﷺ ) دەستی راکێشاوە تاکو قورئان بخوێنێت کە لە مەجلیسێکدا بوون کۆمەڵێ کەسی تیابوو تازە موسوڵمان بوبون ) .

٢٤- عقبەی کوری عامر ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ :

پێغەمبەر ( ﷺ ) هات بۆلامان وە ئێمە لە صفه بوین ( عقبەی کوری عامر ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) خۆی یەکێک بووە لە هاوەڵانی صفه ، هاوەڵانی صفه شت زۆر لەسەریان هاتووە ، کۆمەڵێک کەس بوون کە کەسابەتێکی ئاسانیان کردوە ، بەیانیان زوو لە دوای نوێژ دەرۆشتن بۆ دار برین ، وە هەندێکیشیان دەچون بۆ ئاو هێنان لە بیر و شوێنە دورەکان ، دەیانهێنایەوە و لە بازاردا دەیان فرۆشت ، تاوەکو نیوەرۆ ، ( نیوەرۆ دەچونە ژێر کەپرێک خۆیان فێری قورئان دەکرد و خەڵکیان فێری دەکرد ( النهایه ( ٣ / ٣٧ ) ، پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی : ئایا کێ لە ئێوە حەز دەکات بروا بۆ بطحان یان عەقیق ، ( بطحان شوێنێکە لە مەدینە و دۆڵە ، وە عەقیقیش بەهەمان شێوە شوێنێکە لە مەدینە ، بەڵام فەرقیان ئەوەبوو کە عەقیق زیاتر داری لێبوو بطحان زیاتر ئاوی لێبوو ) ، هەموو رۆژێک دو وشتری پشت بەرز و قەڵەو بێنێتەوە ، وە بیانبات بەبێ ئەوەی توشی تاوان یان پچرانی سیلەی رەحم بێت ، فەرمووی : وتمان : ئەی پێغەمبەر ( ﷺ ) هەموومان حەزمان لەوەیە ، فەرمووی : هەرکەس لە ئێوە دەروات بۆ مزگەوت و دو ئایەت لە کتێبی الله عزوجل فێر دەبێت خێرترە لەوەی کە دو وشتر بێنێتەوە ، وە سێ ئایەت خێرترە بۆی لە سێ وشتر ، وە چوار ئایەت خێرترە بۆی لە چوار وشتر ، زیاتر فێربێت باشترە لە زیاتر.

## باب ( ٣ )

## فەزڵی کۆبونەوە بۆ دەرسی قورئان لە مزگەوت

٢٥- لە ابی هریرەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

قەومێک لە ماڵێک لە ماڵەکانی الله عزوجل دابنیشن ، کتێبی الله عزوجل بخوێننەوە ، وە لە نێوان خۆیاندا بیخوێنن و دیراسەی بکەن ، ئیلا بە مەلائیکە چواردەور دەدرێن ، وە بە رەحمەت دادەپۆشرێن ، وە الله لای ئەوانەی کە لایەتی باسیان دەکات ( لای فریشتەکان ) ، وە هەرکەسێک کردەوەکانی خاوی بکاتەوە ( واتا پێشی نەخات ) ، ئەوا رەچەڵەک و خزمایەتی خێرای ناکاتەوە ( واتا پێشی ناخات ) .

٢٦- لە ابی هریرەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

ئەگەر قەومێک لە ماڵێک لە ماڵەکانی الله عزوجل کۆبونەوە ، کتێبی الله عزوجل بخوێننەوە ، وە لە نێوان خۆیاندا بیخوێنن و دیراسەی بکەن ، ئیلا ئارامی دادەبەزێرە سەریان ، وە بە رەحمەت دادەپۆشرێن ، وە بە مەلائیکە چواردەور دەدرێن ، وە الله لای ئەوانەی کە لایەتی باسیان دەکات .

٢٧- لە هارونی کوری عنترەوە ( رحمە الله ) دەفەرمووێ :

پرسیارم کرد لە ابن عباس ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) وتم :باشترین کردەوە چیە ؟ فەرمووی : یادی الله عزوجل گەورەترینە ، هەرقەومێک لە ماڵێک لە ماڵەکانی الله دابنیشن ، وە لە نێوان خۆیاندا بیخوێنن و دیراسەی بکەن ، وە یەکتری فێر بکەن ، ئیلا مەلائیکە دەیانخاتە سێبەرەوە بە باڵەکانیان ، وە دەبن بە میوانی الله عزوجل تاکو ئەو کاتەی دەچنە سەر خواس و باسێکی دیکە.

# باب ( ٤ )

## باسی ئەخلاقی ئەهلی قورئان

محمدی كوری الحسين ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

٢٨- پێویستە لەسەر ئەو كەسەی كە الله فێری قورئانی كردوە و فەزلی و چاكەی داوەتە سەر غەیری خۆی لەوانەی كە فێری قورئان نەبونە ، وە خۆشیویستوە لەوەی كە كردویەتی بە ئەهلی قورئان ، وە ئەهلی الله و لە تایبەتەكانی اللهیە ، وە لەوانەیشە كە الله وەعدی پێداوە بەوەی كە فەزل و چاكەی گەورەی بۆ هەیە ، لەوەی كە پێشتر باسمان كرد ( لەو فەزل و چاكەی لە ئایەت و فەرمودەكانی پێشودا باسمان كرد ) ، دەبێت لەوانە بێت كە الله دەفەرمووێ : ( يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ ) ( البقره : ١٢١ )

( واتا قورئان دەخوێنن و دەوری دەكەنەوە )

لە تەفسیریدا وتراوە : كرداری پێدەكەن و حەقی كرداركردنەكەیشی پێدەدەن .

٢٩- وە لەوانەی كە پێغەمبەر ( ﷺ ) دەفەرمووێ :

ئەو كەسەی كە قورئان دەخوێنێت و تێیدا زیرەكە لەگەڵ فریشتە بەرێزەكانە ، وە ئەو كەسەیشی كە قورئان دەخوێنێت و لەسەری قورسە دو ئەجری بۆ هەیە .

رونکردنەوە : ئەجرێک لە لەبەرکردنەکەی و مراجەعە کردن و کردەوە پێکردنەکەی ، وە ئەجرێک بۆ ئەوەی کە قورسی دەکەوێتە سەری لە خوێندنەوە و تەجویدەکەی .

٣٠- عیسى کوری یونس ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

ئەگەر عەبدێک خەتمی قورئان بکات ئەوا مەلائیکە بەینی چاوەکانی ماچ دەکات .

٣١- پێویستە قورئان بکاتە بەهاری دڵی ، نۆژەنی ئەو شتانەی پێ بکاتەوە کە دڵی پێ روخاندوە ( بۆ نمونە سیفەتێکی خراپ هەیە لە تۆدا ، وە تۆ کە قورئانەکەت خوێندەوە ئەو سیفەتە تەرک دەکەیت ئەوا تۆ دڵی خۆتت نۆژەن کردوەتەوە ) ، ئەدەب وەربگرێت بە ئادابەکانی قورئان ، وە ئەخلاقی جوان بکات بە رەوشتانێکی شەرەفمەندانە ، کە لە ئەو خەڵکانە جیای بکاتەوە کە قورئان ناخوێنن ،

پێویستە لەسەری ئەمانە بەکار بهێنێت

لەخواترسان لە پەنهان و ئاشکرادا ، بەکارهێنی وەرع لە خواردن و خواردنەوە ( وەرع بریتیە لە : وازهێنان لە ئەو شتانەی کە شوبهە و گومانی لەسەرە وە هەرشتێک بتبات بۆ مەکروهیش واز لەوە بهێنیت ) ، وە جل پۆشین ، وە ئەو جێگەیەی کە تێیدا دادەنیشیت ( واتا ماڵێکی سادەی هەبێت ) .

بەرچاو رون بێت بە زەمانەکەی وە فەسادی ئەهلەکەی ، وە ئاگادری دینەکەی بێت .

پلەو پایەی خۆی بپارێزێت ، وە خەمباربێت بۆ ئەو شتانەی کە کارو باری خراپ دەکات .

زمانی بپارێزێت ، وتە جوانەکان هەڵبژێرێت ( واتا لە ناو قسەکاندا جوانترین قسە هەڵبژێرێت و قسەکانی جیاوازە لەوانەی کە قورئانیان نەخوێندوەتەوە ) .

ئەگەر قسە بکات بە علم قسە دەکات ئەگەر وای بینی لە قسەکەیدا خێر و چاکە هەیە ، وە ئەگەر بێدەنگ بێت دەزانێت کە بێدەنگی بۆ ئەو خێرە .

خۆهەڵقورتاندن بە کەمی لەو شتانەی کە پەیوەندی بە ئەوەوە نیە .

دەترسێت لە زمانی زیاتر لە دوژمنەکەی .

زمانی زیندانی دەکات وەکو چۆن دوژمنەکەی زیندانی دەکات ، بۆ ئەوەی لە شەر و خراپەی عاقیباتی پارێزراو بێت .

کەمی پێکەنین بەو شتانەی کە خەڵکی پێی پێدەکەنێت چونکە دەرئەنجامی پێکەبین خراپە .

ئەگەر دڵخۆش بوو بە شتێک کە لەگەڵ حەقدا یەکی گردەوە ئەوا بزە پێکەنین دەکات .

رقی لە گەمە کردنە لە ترسی گەمەو گەپ ، ئەگەر گاڵتەیەکیشی کرد ئەوا بە حەقەوە دەیکات .

دەموچاوی کراوەیە ، وە وتەکانی چاکن ، مەدحی شتێک ناکات کە لە ناو خۆیدا هەبێت چجای شتێک کە لە ناویدا نەبێت .

له نەفسی خۆی دەترسێت و بەوەی کە شتێک لە نەفسیدا زاڵ ببێت بەسەریدا و الله توره بکات .

غەیبەتی کەس ناکات ، رقیشی لە کەس نیە ، وە جوێن بە کەس نادات ، وە دڵیشی بە موسیبەت خۆش نابێت ، سنوور نابەزێنێت بەرامبەر کەس ، حەسویدش نابات ، گومان بە هیچ کەسێکیش نابات ئیلا کەسێک کە شایستە نەبێت ( واتا گومانی خراپ ) .

ئەگەر حەسودی ببات بە علم حەسودی دەبات ، وە ئەگەر گومانی خراپ بە کەسێک ببات ئەوا بە علم دەیبات ، وە قسە دەکات لەو عەیبانەی کە لە ئینساندا هەیە بە علمەوە ، وە ئەگەر بێدەنگ ببێت ئەوا بە علمەوە بێدەنگ دەبێت ( واتا لەسەر شتێک بێدەنگ دەبێت کە دەزانێت قسە کردن تێیدا سودی نیە ) .

قورئان و سونەتی فیقهی کردوەتە بەڵگە بۆ هەموو رێنمویی رەوشتێکی باش و جوان .

هەموو ئەندامەکانی دەپارێزێت لەو شتانەی کە قەدەغە کراوە .

ئەگەر رێی کرد بە علمەوە رێدەکات ، وە ئەگەر دانیشت بە علمەوە دادەنیشێت .

کۆشش دەکات بۆ ئەوەی خەڵکی لە زمان و دەستی پارێزراو بن .

بێئاگا نابێت ، خۆ ئەگەر بێئاگای بەرامبەر کرا ئەوکات نەرم و نیانی دەنوێنێت .

ستەم ناکات ، خۆ ئەگەر ستەمیانیش لێ کرد لێبوردە دەبێت .

سنور نابەزێنێت ، خۆ ئەگەر سنوریانیش بەزاند بەرامبەری سەبری لەسەر دەگرێت .

قین و رق دەخواتەوە بۆ رەزامەندی پەروەردگاری ، هەروەها رقی لە دوژمنەکانی دەبێتەوە .

خاکی و خۆبەکەمزانە لە نەفسیدا ، خۆ ئەگەر حەقێکیان پێ وت ئەوا وەری دەگرێت ، چجای بچوک بێت یان گەورەبێت.

داوا لە الله تعالی دەکات کە پلە و پایەی بەرز بکاتەوە و داوا لە دروستکراوەکانی ناکات .

رقی لە گەورەیە ( واتا خۆبەگەورە زانین ) ، وە لێیشی دەترسێت .

بە قورئانەوە ناخوات ( واتا ئیش بە قورئانەوە ناکات ، بۆ نمونە قورئان خوێنەکان کە بە پارە لە تەعزێکاندا بە پارە قورئان دەخوێنن یان هەر شوێنێکی دیکە ) ، وە پێی خۆش نیە بەهۆی قورئانەوە پێداویستیەکانی بۆ ئەنجام بدرێت .

وە بەدوای ماڵ و منداڵی سەرکردەکانەوە نیە .

وە نایبات بیکاتە خزمەتکاری نەوەکانی مەلیکەکان ( واتا قورئان نابات ) .

ئەگەر خەڵکی شتانێکی زۆریان دەسکەوێت لەدونیادا بەبێ تێگەشتن و بەرچاورونی ، ئەوا ئەو کەمدەسدەخات بە تێگەیشتن و بە زانستەوە .

ئەگەر خەڵکی شتی گرانبەها بپۆشێت ئەوا ئەو شتێک لە حەلال دەپۆشێت بۆ ئەوەی عەورەتی داپۆشێت .

ئەگەر پێی بەخشرا ، ئەوا ئەمیش زۆری لێ دەبەخشێت ، وە ئەگەر کەمی پێبەخشرا کەم دەبەخشێت .

رازیە بە کەم و بەسیەتی ، وە دەترسێت لە دونیا بەوەی کە لە سنور دەریکات .

دوای واجبەکانی قورئان و سوننەت دەکەوێت .

بخوات بە علم دەخوات ( ئادابەکانی خواردن ) ، بخواتەوە بە علم دەخواتەوە ، جل لەبەربکات بە علمەوە لەبەری دەکات ( واتا جلەکە حەلال بێت ) ، وە بە علم دەخەوێت ، وە جیماع بە علمەوە دەکات ، هاورێیەتی دەکات بە علمەوە ، وە سەردانی دەکات بە علم ، وە داوای مۆڵەت دەکات بە علم ، وە سەلام دەکات بە علمەوە ، وە دراوسێیەتی دراوسێکەی دەکات بە علمەوە .

لەسەر خۆی پێویستی دەکات کە لەگەڵ دایک و باوکی باشبێت ، شانیان بۆ دەچەمێنێتەوە ، وە کاتێک ئەوان دەنگیان بەرز دەکەنەوە دەنگی نزم دەکاتەوە ، وە پارەیان پێ دەدات ، بە چاوی رێز و رەحمەتەوە سەیریان دەکات ، دوعایان بۆ دەکات کە بمێننەوە ، کاتێک گەورە دەبن سوپاسیان دەکات ، بێزاریان ناکات ، وە رقیشی لێیان نابێت ، ئەگەر داوای شتێکیان لێ کرد ئەوا یارمەتیان دەدات ، خۆ ئەگەر داوای شتێکیان لێ کرد ئەگەر سەرپێچی بوو ئەوا گوێرایەڵیان ناکات ، وە نەرمو نیانی و بەئەدەبەوە ئەو شتانە رەت دەکاتەوە کە سەرپێچیە دەیگەرێنێتەوە بۆیان ( واتا داواکاریەکە رەت دەکاتەوە ) ئەو شتە ناشرینە رەت دەکاتەوە کە ئەوان نازانن بە جوانی بیکەن و مامەڵەی لەگەڵدا بکەن .

سیلەی ڕەحم دەگەیەنێت ، وە ڕقی لە دابرانە ، هەرکەس دابرانی کرد ئەم دابران ناکات ( واتا هەرکێ سەردانی نەکرد ئەم هەر دەیکات ) ، وە هەرکەس لەبەرامبەریدا سەرپێچی الله عزوجل کرد ئەم لەبەرامبەردا گوێرایەڵی دەکات ( واتا وەک ئەو ناکات ) .

هاوڕێیەتی ئیمانداران دەکات بە علمەوە ، لەگەڵیاندا دادەنیشێت بە علمەوە ، هەرکەسێک هاوڕێیەتی بکات سودی پێ دەگەینێت .

زۆر بەجوانی لەگەڵ کەسێ دادەنیشێت کە لەگەڵیا دابنیشێت .

ئەگەر کەسێک فێر بکات ، ئەوا بە لەسەر خۆی فێری دەکات ، بە توندی نایکات کاتێک هەڵە دەکات و شەرمەزاری ناکات .

لەکاروبارەکانیدا نەرم و نیانە ، وە ئارامگرە لە فێرکردنی خێردا .

فێرخواز لەگەڵیدا مورتاحە ، وە ئەو کەسەی لەگەڵیدا دادەنیشێت دڵخۆشە ، وە کاتێک لەگەلیدا دادەنیشیت توشی خێر دەبیت .

بەئەدەبە لەگەڵ ئەو کەسەی کە لەگەڵیدا دادەنیشێت بە ئەدەبی قورئان و سوننەت .

ئەگەر توشی موسبەتێک بوو قورئان و سوننەت دەبن بە ئەدەبکار بۆی .

خەمبار دەبێت بە علمەوە ، دەگریەت بە علمەوە ، ئارام دەگرێت بە علمەوە ، خۆی پاک دەکاتەوە بە علمەوە ( زانایان دەفەرموون : خۆ پاک کردنەوە دەستنوێژە ، خۆشۆردنە ، سیواک کردنە ، لابردنی موی زیادەیە ، خەتەنەکردنە ، خۆبۆنخۆش کردنە ) ، نوێژ دەکات بە علمەوە ، ناخی پاک دەکاتەوە بە علمەوە ، وە سەدەقە بە علمەوە ، ڕۆژو دەگرێت بە علمەوە ،

حەج دەكات بە علمەوە ، جیهاد دەكات بە علمەوە ، كەسابەت دەكات بە علمەوە ، وە دەبەخشێت بە علمەوە ، دڵی خۆش دەبێت بە شتەكان بە علمەوە ، وە ئەگەر خۆی بگرێتەوە لە بابەتێک بە علمەوە خۆی دەگرێتەوە ، چونكە قورئان و سوننەت ئەدەبی داوە .

دەوری لاپەڕەكانی قورئان دەكاتەوە بۆ ئەوەی نەفسی خۆی پێ ئەدەب بدات ، ڕازی نابێت لەسەر نەفسی خۆی ئەنجامی فەرزەكانی الله بكات بە جەهلیەوە .

علم و فقه دەكاتە ڕێگەنیشاندەری خۆی بۆ هەموو خێرێک .

ئەگەر دیراسەی قورئان بكات ئەوا بە تێگەشتن و ئەقڵەوە دەیكات .

خەمی ئەوەیە تێبگات لەو شتانەی كە الله : لەسەری پێویستی كردوە ، وە دوای ئەو شتانەیش بكەوێت كە ئەمری پێكراوە ، وازبهێنێت لەو شتانەی كە نەهی لێ كراوە ، نابێت خەمی ئەوەی بێت كە كەی سورەتەكە تەواو بكات ؟

وە خەمی ئەوەیە : كەی الله بەسی بێت جگە لەوانەی دیكە .

( پاشان ئیمام كۆمەڵێک پرسیاری هێناوە كە دەبێت هەڵگرانیقورئان لە خۆیانی بكەن كە دەفەرمووێ : )

كەی ببم لە لەخواترسان ؟

كەی ببم بە چاكەكاران ؟

كەی ببم بە لەوانەی كە پشت بە الله دەبەستن ؟

كەی ببم لەوانەی كە خاشعن ؟

کەی ببم بە یەکێک لە ئارام گران ؟

کەی ببم بە یەکێک لە راستگۆیان ؟

کەی ببم بە یەکێک لە لەخواترسان ؟

کەی ببم لەوانەی کە ئومێدەوارن ؟ ( واتا یەکێک بێت لەوانەی کە ئومێدەوار بن کە الله عیبادەتەکانی لێ وەرگرتبێتن )

کەی ببم لەوانەی کە زاهیدن ؟

کەی حەزم بە دوارۆژ بێت ؟

کەی تەوبە بکەم لە تاوانەکان ؟

کەی قەدری نیعمەتە بەدوای یەکەکان بگرم ؟ کەی شوکری لەسەر بکەم؟

کەی تێبگەم لە وتەکانی الله ؟

کەی تێبگەم لەو شتانەی کە دەیخوێنمەوە ؟

کەی زاڵبم بەسەر نەفسی خۆمدا لەو شتانەی کە حەزی لێدەکات ؟

کەی جیهاد بکەم لە پێناو الله و حەقی جیهادەکەم بدەم ؟

کەی زمانم بپارێزم ؟ کەی چاوەکانم بپارێزم ؟ کەی داوێنم بپارێزم ؟

کەی شەرم لە الله بکەم بە شایسەی ؟

( زانایان دەفەرموون شەرم چەند بەشێکە : شەرم کردن لە الله ، وە شەرم کردن لە ئینسانەکان ، وە لە مەلائیکەکان ، هەندێ لە زانایان

دەفەرموون وە شەرم لە ئاژەڵەکانیش بۆیە دەبێت ئەم بەشانەی شەرم لەخۆتدا کۆبکەیتەوە )

کەی مەشغوڵ بم بە عەیب و عارەکانم ؟

کەی ئەو شتانە چاک بکەمەوە کە تێکم داوە ؟

کەی لێپرسینەوە لە نەفسی خۆم بکەم ؟

کەی چاکە کۆ بکەمەوە بۆ رۆژی قیامەت ؟

کەی لە الله رازی ببم ؟

کەی متمانەم بە الله بێت ؟

کەی پەند لە قورئان وەربگرم ؟

کەی بە زکری الله مەشغوڵ بم و لە زکری غەیری ئەو بێباک ببم ؟

کەی ئەو شتانەم خۆش بوێت کە الله خۆشی دەوێت ؟ کەی رقم لەو شتانە ببێت کە الله رقی لێیە ؟

کە ئامۆژاری بکەم لەبەر الله ؟

کەی لە کردەوەکانمدا نیەتپاک و دڵسۆز بم ؟

کەی هیواکانم کورت بکەمەوە ؟ ( واتا لە دونیادا )

کەی خۆم حازر بکەم بۆ رۆژی مردن کە رۆژی مردنم دیار نیە ؟

کەی قەبرەکەم نۆژەن بکەمەوە ؟

کەی بیربکەمەوە لەو حالەتەو توندی حالەتەکە ؟

کەی بیربکەمەوە لە تەنیایم لەگەڵ پەروەردگارم ؟

کەی بیر بکەمەوە لە سەرئەنجامم ؟ ( واتا بەهەشتە یان جەهەنەم )

کەی ئاگاداربم لەو شتەی کە پەروەردگارم ئاگاداری کردمەتەوە لە ئاگرێک کە گەرمیەکەی زۆر توندە ، هەروەها قوڵایەکەی زۆر قوڵە ، وە زۆر درێژە ، خەڵکەکەی تێدا نامرن تا ئیسراحەت بکەن ، پێیان ناوترێت کە چاوپۆشی دەکرێت لە هەڵەکانیان ، ئەوانەی بونەتە عیبرەت رەحمیان پێ ناکرێت ، خواردنیان زەقومە ، وە خواردنەوەیان حمیمە ( ئاوی گەرمە ) ، هەموو کاتێک پێستەکانیان کۆن دەبێت ئەوا پێسەیەکی دیکەیان بۆ نوێ دەکەنەوە بۆ ئەوەی سزا بچێژن ، پەشیمان بونەوە لە کاتێکدا پەشیمان بونەوە دادیان نادات ، گازیان لە دەستی خۆیان گرد و داخیان خوارد لەسەر کەمتەرخەمیەکانیان بەرامبەر گوێرایەڵی الله و ئەنجامدانی سەرپێچیەکان .

یەکێک لێیان وتی : ( يَا لَيْتَنِي قَدَّمْتُ لِحَيَاتِي ) ( الفجر : ٢٤ )

( واتا : خۆزگە لە دونیادا کاری چاکەم پێش بخستایە بۆ ئەم ژیانەم )

وە یەکێکی تریان وتی : ( حَتَّى إِذَا جَاءَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ ( ٩٩ ) لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلاَّ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ ( ١٠٠ ) ( المؤمنون : ٩٩ - ١٠٠ )

( واتا : بێبڕوایان وەک خۆیان دەمێننەوە هەتا کاتێک مردن دێت بۆ هەر کامیان ئەوسا دەڵێ ئەی پەروەردگارم بمگێڕەرەوە بۆ دونیا ، بەڵکو کردەوەی چاک بکەم لە بری ئەوەی نەمکردوە لەو تەمەنەی لەدەستم چوو نەخێر بێگومان ئەمەی دەیڵێ تەنها قسەیەکە ئەو دەیڵێ ئەگەر بگەرێتەوە بۆ دونیا

هەروەک جاران دەبێت و لە پێشیانەوە بەرزەخێک هەیە تا ئەو رۆژەی زیندوو دەکرێنەوە )

وە یەکێکی تریان وتی : ( يَا وَيْلَتَنَا مَالِ هَذَا الْكِتَابِ لا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلا كَبِيرَةً إِلاَّ أَحْصَاهَا ) ( الكهف : ٤٩ )

( واتا : ئەی هاوار بۆ ئێمە ئەم نامە و دەفتەرە چیە یچ کردەوەیەکی بچوک و گەورەی بەجێنەهێشتووە و تۆماری کردوە )

وە یەکێکی تریان وتی : ( يَا وَيْلَتَى لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلانًا خَلِيلا ) ( الفرقان : ٢٨ )

( واتا : ئای تیاچون بۆ من خۆزگە فلان کەسم نەکردایە بە هاوەڵ و خۆشەویستی خۆم )

وە گروپێک لێیان وتی لە کاتێکدا دەموچاویان جۆرەها سزای پێوە دیاربوو ، وتیان : ( يَا لَيْتَنَا أَطَعْنَا اللَّهَ وَأَطَعْنَا الرَّسُولا ) ( الأحزاب : ٦٦ )

( واتا : خۆزگە گوێرایەڵی الله و پێغەمبەرمان بکردایە )

ئەم ئاگرە ئەی کۆمەڵەی موسوڵمانان ، ئەی هەڵگرانی قورئان ، الله موسوڵمانانی لێ ئاگادار کردونەتەوە تەنها لە یەک شوێندا با لە کتێبەکەیدا وەکو رەحمەتێک لە پەروەردگارەوە بۆ ئیمانداران ، الله عزوجل پێیانی فەرموو : ( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ) ( التحريم : ٦ )

( واتا : ئەی ئەوانەی باوەرتان هێناوە بگەڕێنەوە بۆلای الله بەگەڕانەوەیەکی ئێجگاری تا پەەوەردگارتان کە گوناهەکانتان خۆش ببێت وە بتانخاتە ناو باخاتێکەوە کە دەروا بە ژێریدا جۆگە ئاوی زۆرلە رۆژێکدا کە الله پێغەمبەر ( ﷺ ) و کەسانێ کە باوەریان هێناوە لەگەڵیدا سەرشۆریان ناکات روناکی ئیمان دەروات لە پێشیانەوە لەلای راستیانەوە دەڵێن ئەی پەروەردگارمان روناکی یەکەمان بۆ زیاد و تەواو بکە وە لێمان خۆش ببە بەراستی هەر تۆیت بەسەر هەموو شتێکدادەسەڵاتداری )

وە الله عزوجل دەفەرمووێ : ( وَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ) ( العمران : ١٣١ )

( واتا : وە خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی کە ئامادە کراوە بۆ بێباوەرەکان )

وە الله عزوجل دەفەرمووێ : ( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ( الحشر ١٨ )

( واتا : ئەی ئەوانەی کە باوەرتان هێناوە لە الله بترسن وە هەموو کەسێک با سەرنج بدات بزانێ چی پێش خەی ناردوە بۆ پاشەرۆژی وە لە الله بترسن بەراستی الله شارەزایە بەوەی کە دەیکەن )

پاشان ئیماندارانی ئاگادار کردوەتەوە کە بێئاگا نەبن لەوەی کە فەرزی کردوە لەسەریان ، وە بەوەیش کە پەیمانی پێداون کە لە دەستی نەدەن ، هەروەها سنورەکانی بپارێزن لەو سنورانەی کە دیاری کردوە ، وە نەبن لەو کەسانەی کە فاسق بون و لە فەرمانەکانی دەرچون ، سزای دا بە جۆرەها سزا ، الله عزوجل پێیانی فەرموو : ( وَلا تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّهَ فَأَنسَاهُمْ أَنفُسَهُمْ أُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ) ( الحشر : ١٩ )

( واتا : وە ئێوە وەکو ئەو کەسانە مەبن کە اللەیان لەبیرچویەوە ، جا اللەیش وای بەسەر یەنان کە خۆشیان لەبیرببنەوە کە هیچ کردەوەیەکی چاک بۆ دوارۆژیان پێشنەخەن ، ئەوانە خۆیان لە رێ لایان داو فاسق بون)

پاشان ئیماندارانی فێرکرد کە ( لا يَسْتَوِي أَصْحَابُ النَّارِ وَأَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمُ الْفَائِزُونَ ) ( الحشر ٢٠ )

( واتا : دۆزەخیان و بەهەشتیان وەک یەک نین بەهەشتیان رزگارسەرکەوتون )

٣٢- ئیمانداری ئاقڵ ئەگەر قورئان بخوێنێت ، قورئان وەکو ئاوێنە دەبێت بۆی ئەو کردەوە چاکانەی تێدا دەبینێت کە دەیەوێت بیکات ، وە ئەو شتە ناشرینانەیشی تێدا دەبینێت ، هەروەها ئەوانەیش کە پەروەردگاری ئاگاداری کردوەتەوە لێی ، وە ئەو شتانەیش کە پەروەردگاری ترساندویەتی بەوەی کە سزای بدات ، وە ئەوەیش کە الله پێی خۆشە ئەوە ئەویش پێی خۆشە و ئارەزومەندە و ئومێدەوارە کە ئەنجامی بدات .

هەرکەس ئەمە سیفەتی بێت ، یان لەم سیفەتەوە نزیک بێت ، ئەوا قورئانی خوێندوە و حەقی خوێندنەوەکەیشی داوە ، هەروەها سەرپەرشتیشی کردوە بەو شێوەی کە شایستەیە ، قورئان دەبێتە شاهید بۆی و شەفاعەت کار و خەمرەوێن و پارێزەریەتی .

وە هەرکەس ئەمە سیفەتی بێت ، ئەوا سودی بەخۆی گەیاندوە و بە ئەهلەکەیشی ، خێر و چاکەی گەراندوەتە سەر دایک و باوکی و منداڵەکەی ، هەموو خێرێک لە دونیا و دوارۆژدا.

٣٣- منكر له سەهلی كوری معاذی الجهنیەوه ، له باوكیەوه ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) ، له پێغەمبەرەوه ( ﷺ ) دەفەرمووێ :

هەركەسێک قورئان بخوێنێتەوه و كاری پێبكات ، باوكی ئەم كەسە له رۆژی قیامەتدا تاجێک دەكرێتە سەری ، روناكیەكەی جوانترە له روناكی خۆر له ماڵەكانی دونیادا ئەگەر تێیدابێت ، ئەی گومانتان چیه سەبارەت بە كەسێک كە خۆی كار بە قورئان دەكات .

رونكردنەوە : ضعیفە چونكە زبانی كوری فائد له سەنەدەكەیدا هەیە ، ئیمامی احمد ( رحمه الله ) دەفەرمووێ : أحاديث زبان منكره . ( العلل ) ( ٤٤٨١ )

٣٤- ضعیف خیثمه ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

ئافرەتێک بەلای عیسی كوری مریەمدا ( علیه سلام ) تێپەری وتی : خۆشبەحالی بۆ ئەو باوەشەی كە تۆی هەڵگردوە ، وە خۆشبەحالی ئەو مەمكەی كە تۆ شیرت لێ خواردوە ، عیسی ( علیه سلام ) فەرمووی : خۆشبەحالی ئەو كەسەی كە قورئان دەخوێنێتەوه و كاری پێدەكات .

٣٥- منكر له عبداللّٰهی كوری بریدەوه ، له باوكیەوه ، له پێغەمبەرەوه ( ﷺ ) دەفەرمووێ :

له رۆژی قیامەت قورئان دێت ( مەبەستی ئەوەیە پاداشتی قورئانخوێندن دێت نەک خودی قورئان بێت ) بۆ لای كەسێک وەكو پیاوێكی رەنگ گۆڕاوی لاواز وایە ، كەسەكە پێی ئەڵێت : تۆ كێی ؟ ئەڵێت : من ئەو كەسەم كە له رۆژدا تینووم كردیت و شەونخونیم پێ كردیت .

رونكردنەوە : رواە احمد ( ٢٢٩٥٠ ) ، وە ابن ماجە ( ٢٧٨١ ) ، سەنەدەكەی بشیری كوری مهاجری تێدایە ، ئیمامی احمد دەفەرمووێ : منكرە .

٣٦- لە مامی ایاسی كورئ عامرەوە ، لە علی كوری ابی طالبەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) پێی وت :

ئەگەر تۆ بمێنیتەوە قورئان دەخوێندرێتەوە بەسەر سێ كۆمەڵەدا

كۆمەڵێک بۆ الله

كۆمەڵێک بۆ دونیا

كۆمەڵێک بۆ مناقەشە ، هەركەس بەدوایەوە بێت پێی دەگات .

محمدی كوری الحسین ( رحمە الله ) دەفەرمووێ :

باسی ئەخلاقی ئەو كۆمەڵم كرد كە ئەوانەی قورئانیان خوێندوە و بە خوێندنەوەی قورئانیان اللهیان دەوێت .

وە من باسی ئەو دو كۆمەڵەت بۆ دەكەم كە بە خوێندندنەوەی قورئانیان دونیا و مناقەشەیان دەوێت ، هەروەها وەسفی ئەخلاقیان دەكەم تاكو ئەوكەسانەی كە لە الله دەترسن بیان ناسن و لێیان ئاگادارىن.

# باب ( ٥ )

# ئەخلاقی ئەو کەسەی کە قورئان دەخوێنێت مەبەستی پێی الله نیە

محمدی کوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

٣٧- هەرکەس قورئان بخوێنێت بۆ دونیا و بۆ کورەکانی دونیا ، لە رەوەشتەکانی :

ئەوەیە کە حەرفەکانی قورئانی پاراستووە ، وە سنوورەکانی بەزاندووە .

خۆی بە گەورە دەزانێت ، وە لوتبەرزی بەسەر ئەوانی تر دەنوێنێت .

قورئانی کردوەتە شمەک ، لەلای دەوڵەمەندەکان پێی دەخوات ، هەروەها پێداویستیەکانی پێ پر دەکاتەوە .

کورەکانی دونیا بە گەورە رادەگرێت ( واتا ئەوانەی کە ئەهلی دونیان ) ، وە رقی لە هەژارەکانە .

ئەگەر فێری دەوڵەمەندێک بکات بە نەرمی فێری دەکات وەکو تەماحێک بۆ دونیا .

وە ئەگەر فێری هەژارێک بکات توندە لەگەڵیدا ، چونکە دونیای نیە تا تەماحی پێ ببات ، هەژارەکان بەکار دێنێت ، وەکو لوتبەرزیەک بەکاری دەهێنێت لەلای دەوڵەمەندەکان .

ئەگەر دەنگی خۆشبێت ، ئەوا پێی خۆشە بۆ پاشاکان بخوێنێت ، وە نوێژیان پێ دەکات وەکو تەماحێک بۆ دونیایان ، وە ئەگەر هەژارەکان داوای لێ بکەن نوێژیان بۆ بکات ئەوا پێی گرانە لەبەر کەمی ئەو شتانەی کە هەیانە ، چونکە مەبەستی پێی دونیایە ، چونکە ئەمە حالی جێگیربونە لای ئەو .

بەسەر خەڵکیدا شانازی دەکات بە قورئان ، هەروەها لۆمەی خەڵکی دەکات لەسەر لەبەرکردن و جوان خوێندنەوەی قورئان بەهۆی ئەو خوێندنەوانەی کە هەیەتی ( واتا جوان دەیخوێنێتەوە ) ، وەزیادەیەک لە زانیاری دەربارەی شتە نامۆکان لە جۆرە خوێندنەوەکانی قورئاندا ئەگەر تێبفکریایە ئەوکات دەیزانی پێویستە لەسەری کە بەو خوێندنەوەیە نەخوێنێتەوە .

ئەبینی لوتبەرزی هەیە ، زۆر قسە دەکات بەبێ ئەوەی جیاکاری بکات ( واتا جیاکاری بکات لە قسەکانیدا بزانێت کامەی باشە بیکات و کامەی خراپە نەیکات ) ، لەکەداری ئەو کەسانە دەکات کە لەبەرکردنیان وەکو لەبەرکردنی ئەم نیە ، وە ئەگەر بزانێت یەکێک لەبەرکردنەکەی وەکو لەبەرکردنی ئەمە بەدوای عەیبێکیدا دەگەڕێت ، لە مەجلیسەکانیدا لوتبەرزی دەنوێنێت ، خۆی بە گەورە دەزانێت کاتێک فێری جگە لەخۆی دەکات .

خشوع بە هیچ شێوازێک لە دڵیدا جێگەیەکی نیە .

زۆر پێدەکەنێت و خۆی هەڵدەقورتێنێت لەو شتانەی کە پەیوەندی بەوەوە نیە .

خۆی سەرقاڵ دەکات لەوکاتەی کە کەسێک قسەیەک لەسەری بکات لە مەجلیسەکانیدا ، گوێ دەگرێت لە باس و خواسێک کە پێویست نەدەبوو وە پێویست بوو لەسەری گوێ بگرێت لە شتێک کە گرنگتر بوو بۆی .

کاتێک گوێ لە حافظ قورئانێک دەبێت رقی لێ دەبێت ، ئەو زیاتر حەزی لە گوێگردنی قسەی خەڵکیە تا قسەی پەروەردگار عزوجل .

خشوع نایگرێت کاتێک گوێبیستی قورئان دەبێت ، ناگریەت ، خەمباریش نابێت ، هەروەها تێنافکرێت ، وە نایەوێ بیربکاتەوە لەو شتانەی کە بەسەریدا دەیخوێننەوە ، هەرچەندە لەو شتانەیش ئاگادار کراوەتەوە .

حەزی لە دونیایە ، وە ئەوەیشی لە دونیا نزیکی دەکاتەوە ، بەهۆی دونیاوە تورەبێت یاخود رازی دەبێت .

ئەگەر کەسێک لە حەقیدا کەمتەرخەم بێت دەڵێت لە حەقی ئەهلی قورئاندا نابێت کەمو کورتیت هەبێت ( واتا دەڵێت من ئەهلی قورئانم و نابێت کەمتەرخەم بن لەبەرامبەرمدا ) ، وە ئەهلی قورئان پێویستە پێداویستیەکانی پر بکرێتەوە ، حەقی خۆی لە خەلکی وەردەگرێت ، وە ئەو حەقانەیش کە الله لەسەری واجب کردوە لە نەفەسی خۆی وەری ناگرێت ( واتا کەمتەرخەمە ) .

تورە دەبێت لە کەسانی تر و تورەنابێت لە نەفسی خۆی لەبەر الله .

گرنگی نادات لە کوێ دەسی خستوە لە حەرامبێت یاخود لە حەلال ، دونیا لە دڵیدا گەورە بووە ، ئەگەر شتێکی لە دەست بچێت لە دونیا و نەتوانێت دەستی بخات خەمبار دەبێت بەهۆی لەدەستدانیەوە .

ئەدەب وەرناگرێت بە ئەدەبی قورئان ، بێتاقەت نابێت بەرامبەر پەیمانەکانی الله و بەرامبەر هاتنی رۆژی قیامەت ، بێئاگایە لەوەی کە دەیخوێنێت و بەوەیشی کە بەسەریدا دەیخوێننەوە .

خەمی : پیتەکانی قورئانە ، ئەگەر لە شوێنێکدا هەڵە بکات نارەحەتە لەسەری ، ئەویش بەهۆی ئەوەیە جێگای لەلای دروستکراوەکانی الله کەم دەکاتەوە ، وە پلەیشی لەلایان دادەبەزێت ، دەیبینیت خەمبار نیە دەربارەی ئەو شتانەی کە لە نێوان خۆی و الله عزوجل لەدەستی داوە ، بەوەیش کە قورئان ئەمری پێ کردوە و نەهی لێ کردوە هیچ گرنگ نیە بەلایەوە .

ئەخلاقەکانی لە زۆربەی کاروباریدا وەکو ئەخلاقی ئەو کەسانەیە کە هیچ نازانن .

نەفسی خۆی فێری کردار کردن ناکات و بەوەیش کە قورئان لەسەری واجب کردوە ، ئەگەر گوێی لە الله عزوجل بێت کە دەفەرمووێ : ( وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا ) ( الحشر : ٧ ) ،

( واتا : ئەوەی پێغەمبەر ( ﷺ ) پێی داون وەری بگرن و ئەوەی لێتانی قەدەغە کردوە وازی لێبێنن )

واجب بوو لەسەری واجبی بکات لەسەر خۆی کاتێک شوێنکەوتەی علم دەبێت پێویستە بۆ شارەزا بون بێت لەو شتانەی کە پێغەمبەر ( ﷺ ) نەهی لێ کردوە و کە زانی کۆتای پێبێنێت.

کەم سەیری ئەو علمە دەکات کە واجبە لەسەری ئەو شتانەی کە لەنێوان خۆی و الله عزوجل دایە ، وە زۆریش سەیری ئەو علمانە دەکات کە پێی جوان دەبێت لەلای ئەهلی دونیا بەهۆیەوە رێزی لێبگرن .

زانیاری کەمە دەربارەی حەلال و ئەو حەرامانەی کە الله ئاگاداری کردونەتەوە و پاشان پێغەمبەرەکەی ( ﷺ ) بۆ ئەوەی حەلال بە علمەوە ببات و وازیش لە حەرام بهێنێت بە علمەوە .

ئارەزەی فێربونی علمی شارەزابون لە نیعمەتەکان نیە ، هەروەها لە زانستی شارەزابون لە علمی شوکر کردنی بەخشەری نیعمەتەکان نیە .

خوێندنی بۆ قورئان ئاماژە بەوە دەکات کە خۆبەگەورەزانین لە نەفسیدا هەیە ، وە جوانکاری دەکات بۆ ئەو کەسانەی کە گوێی لی دەگرن .

خشوع هیچ دیارێکی نیە بە ئەندامەکانیەوە .

ئەگەر دەرسی قورئان بخوێنێت ، یان دەرسی کەسانی دیکە بدات خەمی ئەوەیە کەی تەواوبێت ، وە خەمی ئەوە نیە کەی تێبگات .

تێنافکرێت لە کاتت قورئان خوێندندا بەو نمونانەی کە لە قورئاندا هاتووە لەسەر پەیمان و پەیمانەکان ناوەستێت .

حەزی بە ڕەزامەندی دروستکراوەکانە ، بەلایەوە گرنگ نیە تورەی پەروەردگاری جیهانەکان .

حەز دەکات بناسرێت بەوەی کە دەرسی زۆر هەیە ، هەروەها خەتمەکانی قورئانی نیشانی خەڵکانی دیکە دەدات بۆ ئەوەی شتێکی دەست بکەوێت لایان ، فیتنەی ئەو حەزی بەوەیە وەسف بکرێت لەلای کەسانی نەزانەوە .

دڵی خۆش دەبێت بە وەسف کردنی بەتاڵ و پروپوچ ، کاروکردەوەکانی لە کارووکردەوەکانی ئەهلی جەهل و نەزانەکانە .

دوای ئەو شتانە دەکەوێت کە نەفسی حەزی لێیەتی بەبێ گرنگی دان بەوەی کە قورئان بە خراپە کردوە .

ئەگەر خۆی قورئان بخوێنێت ئەوا تورە دەبێت لەو کەسانەی کە قورئان دەخوێنن بەسەر کەسانی تردا .

ئەگەر لەلایدا باسی کەسێک لە ئەهلی قورئان بکرێت بە چاکە رقی لێ دەبێت ، وە ئەگەر بە خراپەش باسی بکرێت لەلایدا بەوە دڵی خۆشدەبێت .

بە کەسانی تر رادەبوێرێت ، عەیب دەگرێت لە کەسانی سەروی خۆی .

دوای هەڵەکانی ئەهلی قورئان دەکەوێت بۆ ئەوەی دایانگرێت ، وە خۆیشی بەرزبکاتەوە .

ئاواتەخوازە کەسانی تر هەڵە بکەن ئەویش بیپێکێت .

هەرکەس ئەمە سیفەتی بێت : ئەوا بەر تورەی سەرگەورەو بەخشندە دەبێت .

وە گەورەتر لەوە : ئەگەر دروشمی پیاوچاکان نیشان بدات لە کاتی خوێندنەوەی قورئان ئەوا لە ناخیدا شتانێکی لە دەست داوە کە پێویستە بۆ الله بیکات ، وە ئەو شتانەیش دەکات کە پەروەردگاری نەهی لێ کردوە ، لەسەروی ئەمانەوە حەزی لە سەرکردایەتیە وە مەیلی بۆ دونیا هەیە .

توشی فیتنەی لەخۆبای بون بووە بە لەبەرکردنی قورئان ، ئیشارەتی بۆ بکرێت بە پەنجە ( واتا حەز دەکات خەڵکی پەنجەی بۆ درێژ بکەن و بڵێن ئەوە قورئان خوێنە و بەوە توشی فیتنە بووە ) .

ئەگەر یەکێک لە کەسەکانی دونیا ( ئەهلی دونیا ) یان پاشایەک توشی نەخۆشیەک ببێت ئەگەر داوای لێ کرا کە خەتم بەسەریدا بکات ، وە پەلە دەکات بۆ ئەو کارە و دڵخۆش دەبێت پێی ، وە ئەگەر فەقیرێک توشی نەخۆشیەک ببێت داوای لێ بکرێت کە خەتم بەسەریدا بکات ئەوا قورسە لەسەری .

قورئان لەبەردەکات و دەخوێنێت بە زمان ، کەچی زۆربەی ئەحکامەکانی لەدەست داوە .

ڕەوشتی ڕەوشت و ئەخلاقی نەفامەکانە .

ئەگەر خواردی بەبێ علم دەیخوات ، وە ئەگەر خواردیەوە بەبێ علم دەیخواتەوە ، ئەگەر پۆشی بەبێ علم دەپۆشێت ، ئەگەر جیماعی کرد بەبێ علم جیماع دەکات ، ئەگەر خەوت بەبێ علم دەخەوێت ، ئەگەر هاوڕێیەتی قەومانێکی کرد یان سەردانیانی کرد ئەو سەلامی لێکرد یاخود ئیزنی لێ وەرگردن هەموو ئائەمانە بەبێ علم لە قورئان و سوننەت دەیکات ، ئەگەر کەسانی تر جوزئێک لە قورئان لەبەر بکەن ئەوا داوا لە نەفسی خۆی دەکات بەو شتانەی کە الله لەسەری واجب کردوە بەوەی بە علمەوە فەرزەکان ئەنجام بدات ، لە حەرامەکان دوربکەوێتەوە ، هەرچەندە ئەگەر خۆیشی بۆ ئامادە نەکردبێت ، هەروەها بە پەنجەیش ئیشارەتی بۆ نەکرێت.

محمدی کوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

٣٨- هەرکەس ئەمە ئەخلاقی بێت دەبێتە فیتنەیەک بۆ هەموو ئەوانەی کە توشی فیتنە بوون ، لەبەر ئەوەی ئەگەر کردەوەیەک ئەنجام بدات بە ئەخلاقێک کە باش نەبێت ئەوا نەفامەکان چاوی لێدەکەن ، ئەگەر عەیب

لە نەفامەکە بگیرێت دەڵێت : ئەو کەسە هەڵگری کتێبی اللهیەو ئەمە ئەنجام دەدات ، ئێمە ئەولاترین ئەو شتە بکەین .

هەرکەس ئەمە حالی بێت : ئەوا توشی لێپێچینەوەی گەورە دەبێت و بەڵگەیش لەسەر سابت دەبێت ، وە هیچ عوزرێکی نیە ئیلا دەبێت تەوبە بکات .

من لە دوای رونکردنەوەی ئەم رەوشتە ناشرینانە : ئامۆژگاری من بۆ ئەهلی قورئان ئەوەیە کە پەیوەست بن بە رەوشت و ئاکاری جوان ، وە سارد ببنەوە لە رەوشتی نزم و ناشرین ، الله تەوفیق بە ئێمە و ئەوان ببەخشێت بۆ سەر رێگای راست.

بزانن الله رەحم لە ئێمە و ئێوە بکات من ئەو هەواڵانەم بۆ باسکردونە کە ئاماژە بەوە دەکات کە رقم لێیە لە ئەهلی قورئان ، ئەوانەم بۆ باس کردون کە ئامادەبووم تێیدا ، لەبەر ئەوەی سەیرکەری کتێبەکانمان ئامۆژگاری خۆی بکات لە کاتی خوێندنەوەی قورئان خۆی پەیوەست بکات بە دەست گردن بە واجبەکانەوە ، اللهیش بەخشەری تەوفیقە .

٣٩- عومەری کوری خطاب ( رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ :

سەردەمانێک هات بەسەرماندا کەسێکمان نەدەبینی کە قورئان فێر بێت و مەبەستی پێی الله عزوجل نەبێت ، بەڵام سەردەمێکی ترمان بەسەردا هات ، ترسام پیاوانێک هەبن قورئان فێر ببن و مەبەستیان پێی خەڵک بێت و ئەوەی لەلای خەڵک هەبووە ( پارە و سامان ) بە خوێندنەوەیان بۆ قورئان و لە کردەوەکانیشیاندا ، ئێمە کاتی خۆی دەمانزانی کە پێغەمبەر ( ﷺ ) لە نێوانمان دایە و وەحی دادەبەزی ، وە الله دەربارەی هەواڵەکانی ئێوە

ئاگادارمانی دەکردەوە ، بەڵام ئەمڕۆ پێغەمبەر ( ﷺ ) ڕۆشتووە ، وە وەحی پچراوە ، وە ئەمڕۆ دەتانناسمەوە بەوەی کە دەیڵێم ، هەرکەس خێرێکی ئاشکرا کرد بەهۆیەوە خۆشمان دەوێت ، وە گومانی باشیشی پێدەبەین ، وە هەرکەس شەڕێکی کرد بەهۆیەوە ڕقمان لێ دەبێت ، وە گومانی شەری پێدەبەین ، چونکە نهێنیەکانتان بەینی خۆتان و اللهیە عزوجل .

٤٠- لە عومەری کوری خطابەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ :

ئەی خەڵکینە......

بەهەمان شێوە فریابی باسی کردوە .

محمدی کوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

٤١- ئەگەر عومەری کوری خطاب ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) لە قەومێک بترسایە کە قورئانیان بخوێندایە و لەو کاتەدا کە مەیلیان بۆ دونیا بوو ، ئایا ئێستا گومانت چیە بەم ڕۆژە ؟ .

وە هەواڵی پێداوین پێغەمبەر ( ﷺ ) کە فەرموویەتی : کۆمەڵانێک پەیدا دەبن زۆر بە جوانی و ڕێکی و پێکی قورئان دەخوێنن وەک چۆن داری تیر ریز دەکرێت پێش ئەوەی سەری پێوە بکرێت ، بەڵام قورئانەکە لە پێناوی بەرژەوەندی و پاداشتی دونیا دەیخوێنن ، نەک بە هیوای پاداشتی دوارۆژ .

واتا : داوای ئەو خێرە دەکەن کە پێشخراوە بۆیان لە دونیادا ، وە داوای ئەوە ناکەن کە لە ئاخیرەتدا هەیە.

٤٢- جابری کوری عبدالله ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ:

پێغەمبەر ( ﷺ ) هات بۆلامان ، ئێمەیش کۆمەڵێک لە هاوەڵان قورئانمان دەخوێند عەجەمی و دەشتەکیمان لەناودا بوو ، فەرمووی :

بخوێنن ، قورئان خوێندنی هەمووتان چاکە ، کۆمەڵانێک پەیدا دەبن زۆر بە رێکی و پێکی و جوانی قورئان دەخوێنن وەک چۆن داری تیر ریز دەکرێت پێش ئەوەی سەری پێوە بکرێت ، بەڵام قورئانەکە لەپێناو بەرژەوەندی پاداشتی دونیایدا دەیخوێنن ، نەک بەهیوای پاداشتی دوارۆژ .

رواه احمد ( ١٤٨٥٥ وە ١٥٢٧٣ ) ، وە ابو داود ٨٣٠ صحیح .

٤٣- سهلی کوری سعدی ساعدی ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ :

پێغەمبەر ( ﷺ ) هات بۆلامان ، ئێمەیش قورئانمان دەخوێند ، فەرمووی : سوپاس و ستایش بۆ الله ، قورئانەکەی الله یەکە ( واتا هەمووتان کۆ بوبونەوە لەسەری و خیلافتان تێدا نەبووە والله اعلم ) ، کەچی ئێوە تێتاندایە سورە ، هەتانە سپییە ، تێیشتاندایە رەشە ، بیخوێننەوە پێش ئەوەی کۆمەڵانێک بیخوێننەوە بە جوانی و رێکی و پێکی وەک چۆن تیر ریز دەکرێت ، بەڵام قورئان خوێندنەکەیان لە پێناوی بەرژەوەندی و پاداشتی دونیادایە ، نەک بەهیوای پاداشتی دوارۆژ .

رونکردنەوە : سەنەدەکەی عبداللەی کوری عبیدەی تێدایە ، ابن معین ، وە احمد ، وە ابو حاتم بە ضعیفیان داناوە ( تهذیب الکمال ) ( ١٥ / ٢٦٣ )

٤٤- ابن الهاد دەفەرمووێ : عباسی کوری عبدالمطلیب ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) فەرمووی : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

ئەم دینە دەردەکەوێت و سەردەکەوێت تاکو دین دەگاتە دەریاکان و ئەسپ سواری موسوڵمانان دەیگەیەنن ، پاشان خەڵکانێک دێن قورئان دەخوێنن

، وه کاتێک دەیخوێنن ، دەڵێن : کێ لە ئێمە قورئان جوانتر دەخوێنێت ؟ ، کێ لە ئێمە زاناترە ؟ ، پاشان پێغەمبەر ( ﷺ ) ڕوی کردە هاوەڵانی و فەرمووی : ئایا لەمەدا خێر دەبینن ؟ ، فەرموویان نەخێر ، فەرمووی : ئا ئەوانە لە ئێوەن ، ئا ئەوانە لەم ئوممەتەن ، ئا ئەوانە دەبنە سوتەمەنی ئاگری دۆزەخ .

ابن الهاد نەگەشتووە بە عباسی کوری عبدالمطلب ( تهذيب الكمال ) ( ٣٢ / ١٦٩ )

٤٤- ابن الهاد دەفەرموێ : عباسی کوری عبدالمطليب ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) فەرمووی : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

...... بە هەمان شێوە باسی کرد .

٤٦- ابن عمر ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرموێ :

لە پێشینەکانی ئەم ئوممەتەین پیاوێک لە باشترین هاوەڵەکانی پێغەمبەر ( ﷺ ) ئیلا کە سورەتێک لە قورئانی لەگەڵدا بووە یان هاوشێوەی ئەوە ، وە قورئان قورس بووە لەسەریان ، ڕزق دراون بەوەی کە کرداری پێبکەن ، لە کۆتای ئەم ئوممەتەدا قورئان لەسەریان ئاسانە ( واتا قەدر و قیمەتی نازانن ) تاکو ئەو کاتەی مێردمنداڵ و بیانی دەیخوێننەوە و کردەوەی پێناکەن.

٤٧- عبداللّٰەی کوری مسعود ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرموێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

کەسانێک و قەومێک پەیدا دەبن ئەم قورئانە دەیخوێننەوە وەکو چۆن ئاو دەخۆنەوە ، بەڵام لە قورگیان ناڕواتە خوارەوە .

٤٨- حەسەنی بەصری ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

ئەم قورئانە کۆیلە و مێرد منداڵ خوێندویانەتەوە و هیچ علمێکیان بە تەئویلی نەبووە ( واتا بێئاگابوون لە واتا و ماناکانی ) ، لە سەرەتاوە لە تەئویلەکان تێبگەشتایەن ( واتا خۆیان شارەزا بکردایە لە واتاکانی قورئان ) ، الله عزوجل دەفەرمووێ : ( كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِّيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُوا الأَلْبَابِ ) ( ص : ٢٩ )

( واتا : ئەم قورئانە پر خێر و بەرەکەتە کتابێکە بۆتۆمان دابەزاندووە بۆ ئەوەی لە ئایەتەکانی تێبگەن و تێبفکرن بیر بکەنەوە وە ئەوانەیشی کە خاوەن ئەقل و ژیرین تا یاد بکەنەوە و پەند و ئامۆژگاری وەربگرن )

پاشان فەرمووی : هەروەها ئایەتەکانیان جێبەجێ نەکردوە ( واتا حوکمەکان ) ئیلا ئەو کەسانە نەبێت کە دوای کەوتون ، وە الله زانترە ، پاشان واللەهی بەوە نیە پیتەکانی لەبەر بکەیت و سنورەکانی لەدەست بدەیت ، تا ئەوکاتەی کە یەکێکیان دەڵێت : قورئانم هەمووی خوێندوەتەوە و یەک پیتم لەدەست نەداوە ، واللەهی هەمووی لەدەست داوە ، قورئانی تێدا بەدی ناکرێت ، نە لە رەوشت و نە لە کرداریدا ، تا ئەوکاتەی یەکێکیان دەڵێت : من سورەتێک دەخوێنمەوە بە یەک نەفەس ، واللەی ئەمانە خوێنەر و قاریئ نین ، زانایش نین ، وە دانایش نین ، وە وەرعیانیش نیە ، مادام هەرکاتێک خوێنەرەکان شتی وا بڵێن ، الله لە نمونەی ئەم جۆرە کەسانە لە خەلکی زیاد نەکات .

٤٩- مجاهد ( رحمه الله ) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ( يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ ) ( البقره : ١٢١ )

( واتا قورئان دەخوێنن و دەوری دەکەنەوە )

دەفەرمووێ : کرداری پێدەکەن و حەقی کردارکردنەکەیشی پێدەدەن .

٥٠- عبداللهی کوری مسعود ( رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ :

پێویستە لەسەر هەڵگری قورئان بەوە بناسرێتەوە بەشەو لە کاتێکدا کە خەڵکی خەوتون ( واتا خەریکی شەو نوێژ و قورئان خوێندن و عیبادەت بێت لە کاتێکدا خەڵک خەوتووە ) ، بەرۆژیش بەوە بناسرێتەوە کە خەڵکی بەرۆژو نین ( واتا ئەم بەرۆژووە ) ، وە بە وەرع بناسرێتەوە لە کاتێکدا کە خەلکی خەریکی کردەوەی تێکەڵ و پێکەڵن ( واتا کردەوەی خراپە و چاکە دەکەن ، بەڵام ئەم خۆی دەپارێزێت ) ، وە بە خاکیەکەی ( خۆبەکەم زانین ) لە کاتێکدا کە خەڵک گەورەی دەنوێنن ، وە بە خەمباریەکەی لە کاتێکدا کە خەڵکی دڵیان خۆشە ، وە بە گریانی لە کاتێکدا کە خەڵکی پێدەکەنن ، وە بە بێدەنگیەکەی لەکاتێکدا کە خەڵکی وتو وێژ دەکەن .

محمدی کوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

٥١- ئەم هەواڵانە هەمووی ئاماژە بەوە دەکەن کە لە پێشتردا باسمان کرد لە فەزل و ئەخلاقی ئەهلی قورئان :

پێویستە رەوشتیان دیار بێت لە رەوشتی جگە لەخۆی ، وە لەو کەسانەیش کە بەگوێرەی ئەمان علمیان پێ نیە ، کاتێک بەڵا و موسیبەتێکی توند توشیان دەبێت ئەوا پەنا بۆلای الله دەبەن ، وە پەنا بۆلای دروستکراوەکان نابەن ، الله لەپێشترە بۆیان لە دڵیانەوە ، ئەدەبیان وەرگردوە بە ئەدەبی قورئان و سوننەت ، ئەوان نیشانەیەکن کە خەڵکی چاولێکەرە بە کردەوەکانیان ، لەبەر ئەوەی ئەوان لە تایبەتمەندیەکانی اللهن و لە ئەهلی

اللهەن ، ( أُولَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ) ( المجادله : ٢٢ )

( واتا : ئا ئەمانە حزب و سەربازی اللهەن ئاگاداربن وە بزانن سەربازان و کۆمەڵی الله ئەوانەن کە سەرکەوتوو سەرفرازی راستەقینەن لە دونیا و لە قیامەتدا ).

٥٢- فضیلی کوری عیاض ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

پێویستە لەسەر هەڵگری قورئان پێویستی بە هیچ کەسێک نەبێت لە دروستکراوەکان ، بەتایبەت لە خەلیفەکان ، وە پێویستە خەڵکی پێویستیان بە ئەم بێت .

وە دەفەرمووێ : هەڵگری قورئان هەڵگری ئاڵای ئیسلامە ، نابێت قسەی هیچ و پوچ لەگەڵ ئەو کەسە بکات کە قسەی هیچ و پوچ دەکات ، وە نابێت بە هەڵەدا بچێت لەگەڵ ئەو کەسەی کە بەهەڵەدا دەچێت ، هەروەها نابێت رابوێرێت لەگەڵ ئەو کەسەی کە رادەبوێرێت .

وە دەفەرمووێ : قورئان دابەزیوە بۆ ئەوەی کرداری پێ بکرێت ، وە خەڵکی خوێندەوەی قورئانیان وەک کارکردن بە قورئان لێکرد .

واتا : بۆ ئەوەی حەلالەکانی حەلال بکەن و حەرامەکانی حەرام بکەن ، وە لەسەر ئایەتە لێکچوەکانی بوەستن .

٥٣- ابا الحسن محمد بن محمد بن ابی الورد ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

حذیمه المرعشی نامەیەکی بۆ یوسفی کوری أسباط نوسی فەرمووی :

پێم گەشتووە تۆ دینەکەت فرۆشتووە بە دو دینار ، لای خاوەن شیرەکە وەستاویت و وتوتە : ئەم شیرە بەچەندە ، وتویەتی : بە شەش لەسەر یەکە ، وتوتە : نەخێر بە هەشت لەسەر یەک ( واتا دو دانە کەمتر ) خاوەن شیرەیە وتویەتی : بۆتۆ ، وە تۆی ناسیوە ( واتا تۆی ناسیوە کە قورئان خوێنیت و ئیمامیت ) ، لەسەر سەرت قیناعی ( دەمامک ) بێئاگایان لابدە ، وە ئاگات لە راکشانی مردن بێت ( واتا ئەو کاتەی کە دەتخەنە ناو قەبرەکە و رادەکشێی ) ، وە بشزانە هەرکەس قورئان بخوێنێت و دونیا پێش بخات ئەوە ئەمین نیم لێی کە بەوانە حساب بکرێت ئایەتەکانی الله بە گاڵتەجاری وەرگردبێت .

٥٤- میمونی کوری مهران ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

ئەگەر ئەهلی قورئان صالح و چاک بن ، ئەوا خەڵکی صالح و چاک دەبن .

٥٥- لە بشیر بن ابی عمرو الخولانیەوە ، لە وەلیدی کوری قیسیەوە کە گوێی لە أبا سعیدی الخدري ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) بوو کە فەرموویەتی : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

کۆمەڵە کەسانێک دێن لە دوای چەن ساڵێک ( لە مسند هاتووە لە دوای شەست ساڵ ) ، نوێژەکانیان لەدەست دەدەن ، وە دوای شەهەوات دەکەون ، دەکەونە ناو جەهەنمەوە ، پاشان کۆمەڵە کەسانێک دێن قورئان دەخوێنن لە قورگیان نارواتە خوارەوە ( واتا بۆ ریا و مناقەشە و بەدەست هێنانی دونیایە والله اعلم ) ، سێ جۆر خەڵک قورئان دەخوێنن : ئیماندار ، مونافیق ، فاجر .

بشیر دەفەرمووێ : بە وەلیدم وت : ئەو سیانە کێن ؟

فەرمووی : مونافیق : کافرە پێی .

وە فاجر : پێی دەخوات .

وە ئیماندار : ئیمانی پێی هەیە .

٥٦- خیثمە ( رحمە الله ) دەفەرمووێ :

حەسەنی بەصری فەرموویەتی : لەگەڵ عمرانی کوری حصین بەلای کەسێک دا رۆشتن کە سورەتی یوسفی دەخوێند ، عمران گوێی لە خوێندنەوەکەی گرد ، پاشان کە تەواوی کرد ، داوای رۆزی و ماڵ و سامانی لە خەڵکی دەکرد پێی ، پاشان عمران فەرمووی : با برۆین من گوێم لە پێغەمبەر ( ﷺ ) بووە فەرموویەتی : هەرکەسێک قورئان دەخوێنێت با داوای رۆزی و ماڵ و سامان لە الله بکات پێی ، بەراستی لەمەودوا خەڵکانێک دێن قورئان دەخوێنن داوای رۆزی و ماڵ و سامان لە خەڵک دەکەن پێی .

رونکردنەوە : حسن گوێی لە عمران نەبووە .

٥٧- بە سەنەدێکی دیکە بەهەمان شێوە خیثمە ( رحمە الله ) دەفەرمووێ :

حەسەنی بەصری فەرموویەتی : لەگەڵ عمرانی کوری حصین بەلای کەسێک دا رۆشتن کە قورئانی دەخوێند ، عمران گوێی لە خوێندنەوەکەی گرد ، پاشان کە تەواوی کرد ، داوای رۆزی و ماڵ و سامانی لە خەڵکی دەکرد پێی ، پاشان عمران فەرمووی : با برۆین من گوێم لە پێغەمبەر ( ﷺ ) بووە فەرموویەتی : هەرکەسێک قورئان دەخوێنێت با داوای رۆزی و ماڵ و سامان لە الله بکات پێی ، بەراستی لەمەودوا خەڵکانێک دێن قورئان دەخوێنن داوای رۆزی و ماڵ و سامان لە خەڵک دەکەن پێی .

٥٨- له ئەنەسی کوری مالکەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

له رۆژی قیامەتدا قورئان خوێنەکان دێنن الله تعالى پێیان دەفەرمووێ : ئێوە دەفری کەلامەکەی من بوون ( واتا دەفرێک چۆن شتی تێ دەکەیت ئەوها کەلامەکەی اللهیان لەخۆیان گردووە ) ، حسابی ئێوە وەکو پێغەمبەرانە تەنها جیاوازیتان وەحیە ( واتا وەحیتان بۆ دانەبەزیوە ) .

رونکردنەوە : سەنەدەکەی ابان بن ابی عیاشی تێدایە احمد ( رحمه الله ) دەفەرمووێ : منكرە ، وە يحى ( رحمه الله ) دەفەرمووێ : متروكە ،( تهذيب الكمال ) ( ٢ / ١٩ )

محمدی کوری الحسين ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

لەمەدا رامانگەیاند بۆ ئەو کەسەی کە ئایەتەکانی الله جێبەجێ دەکات و تەدەبور دەکات ، وە له الله دەترسێت ، وە قورئانی کردوەتە قەلغانێک بۆخۆی ، وە ئەو شتانەی فرۆشتووە کە لە ناو دەچن لە پێناو ئەو شتانەی کە دەمێنێتەوە ، وە اللهیش بەخشەری تەوفیقە.

# باب ( ٦ )

# ئەخلاقی قورئان خوێن ئەگەر دانیشت و قورئانی خوێند و دەرسی دایەوە لەبەر الله عزوجل پێویستە لەسەری بە چ ئەخلاقێک هەڵسوکەوت بکات ؟

محمدی کوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

٥٩- پێویستە لەسەر ئەوەی کە الله فێری کتێبەکەی کردوە ، باشتر وایە بۆی لە مزگەوتێک دابنیشێت و قورئان بخوێنێت بۆ الله عزوجل ، پەند لە وتەکەی پێغەمبەر ( ﷺ ) وەربگرێت کە فەرموویەتی : باشترینتان ئەو کەسەیە کە قورئان دەخوێنێت و خەڵک فێردەکات .

پێویستە لەسەری ڕەوشتانێکی شەرەفمەندانە بەکار بهێنێت کە ئاماژە بکات لەسەر لە فەزل و چاکەی خۆی :

وە ئەوە خاکی ( خۆبەکەمزانین ) لە نەفسی خۆیدا بنوێنێت ئەگەر لە مەجلیسیدا خەڵکی دانیشتن ، هەروەها گەورەی کە نەفسی خۆیدا نەنوێنێت.

وه پێی خۆشبێت له مەجلیسیدا رو له قیبله بکرێت ، لەبەر وتەی پێغەمبەر ( ﷺ ) که فەرموویەتی : باشترین مەجلیسەکان ئەو مەجلیسانەیە که رو له قیبله بکرێت . ( ضعیفه )

( بەڵام له زانایانەوه هاتووه که سلیمانی کوری موسى ( رحمه الله ) دەفەرمووێ : سوفیانمان نەبینیوه دابنیشێت ئیلا روی له قیبله کردوه ) .

مصنف ابن ابی شیبه ( ٢٦٤٥٧ )

وه خۆمەبەکمزانین بنووێنێت ئەگەر کەسێک قورئانی فێرکرد ، لێی وەربگرێت به وەرگردنێکی جوان .

وه پێویسته لەسەری له کاتی دەرس دانەوه لەگەڵ هەموو مرۆڤێک ئەو شتانه بەکاربهێنێت وەکو چۆن بۆخۆی بەکاری دەهێنێت .

ئەگەر گەوره یان بچوک ، یان دەوڵەمەند یان فەقیر : داوای لێکرد که دەرسی پێ بداتەوه ، پێویسته لەسەری هەرکەس و حەقی خۆی پێبدات ، وه دادپەروەری بنوێنێت له کاتی دەرس وتنەوه ئەگەر مەبەستی پێی الله عزوجله .

نابێت دەوڵەمەنەکه لەخۆی نزیک بکاتەوه و فەقیرەکه دوربخاتەوه .

وه نابێت نەرمبێت لەگەڵ دەوڵەمەندەکه و توند بێت لەگەڵ فەقیرەکه ، ئەگەر ئەمه بکات ئەوه له کردەوەکەی لایداوه و حوکمه لەسەری دادپەروەر بێت له نێوانیاندا .

پاشان پێویسته لەسەری ئاگاداربێت له نەفسی خاکی بوون بنوێنێت لەگەڵ دەوڵەمەندەکه و لوتبەرزی بنوێنێت لەگەڵ فەقیرەکه ، بەڵکو پێویسته

لەسەری خاکی بێت لەگەڵ فەقیرەکە و لە مەجلیسەکانیدا نزیکی بکاتەوە لە خۆی و هەست و سۆزی هەبێت بۆی بەوە خۆشەویست دەبێت لەلای الله عزوجل .

٦٠- ابو جعفری رازی ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

ڕەبیعی کوری انس ( رحمه الله ) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ( وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ ) ( لقمان : ١٨ )

( واتا : رو لە خەڵک وەرمەگێرە )

دەفەرمووێ : دەبێت لە علمدا دەوڵەمەند و فەقیر لەلات وەکو یەک بن .

٦١- ڕەبیعی کوری انس ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

ابی العالیە ( رحمه الله ) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ( وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ ) ( لقمان : ١٨ )

( واتا : رو لە خەڵک وەرمەگێرە )

دەفەرمووێ : دەبێت لە علمدا دەوڵەمەند و فەقیر لەلات وەکو یەک بن .

محمدی کوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

٦٢- ئەمە بەوە تەئویل دەکرێت کە الله پێغەمبەرەکەی ( ﷺ ) پێ ئەدەب داوە بەوەی کە ئەمری پێ کردوە کە هەژارەکان لەخۆی نزیک بکاتەوە ( وَلا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ ) ( الكهف : ٢٨ ) ،

( واتا : چاوەکانت لەوان لامەدە و وەرمەگێرە )

پاشان فەرمووی : کاتێک کە قەومێک دونیا ویست بوون ، پێیان خۆشبوو کە پێغەمبەر( ﷺ ) لە مەجلیسەکەدا جیایان بکاتەوە ، بەرزیان بکاتەوە لە کەسانی تر ( واتا لە هەژارەکان ) ، پێغەمبەر ( ﷺ ) وەڵامی ئەوەی دانەوە کە داوایان کرد ، نەک لەبەر ئەوەی کە دونیایان دەویست ، بەڵکو لەبەر ئەوەی رایان بکێشێت بۆ ئیسلام ، الله پیغەمبەرەکەی ( ﷺ ) ئاشنا کرد بە جوانترین رەوشتە شەرەفمەندەکان ، ئەمری پێ کرد کە هەژارەکان لەخۆی نزیک بکاتەوە و کراوە بێت لەگەڵیاندا ، وە سەبر لەسەریان بگرێت ، وە ئەو دەوڵەمەندانەیش دور بکاتەوە کە مەیلیان بۆ دونیا هەیە ، وە پێغەمبەر ( ﷺ ) کردی .

وە ئەمە ئەو ئەسلەیە کە هەموو کەسێک کە دابنیشێت و فێری قورئانو علم بێت ، وە فێری ئەدەب ببێت لێیەوە ، وە خۆی پەیوەست بکات بەو رەوشتانەوە ئەگەر الله عزوجل ـی دەوێت بەو کردارەی .

وە من ئەمە لەبەر ئەوە باس دەکەم بۆ ئەوەی سەیرکەری کتێبەکانمان ئەوانەی تێدایە کە بەهۆیەوە نزیک دەبێتەوە لە الله عزوجل کە بخوێنێت بۆ الله عزوجل ، وە هەروەها ئەجر و پاداشتیشی لە الله بوێت نەک لە دروستکراوەکانی.

٦٣- ابی الکنود ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

خەبابی کوری الارت ( رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ) دەربارەی ئەو ئایەتە ( وَلاَ تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ ) ( الأنعام : ٥٢ ) ( واتا : وە ئەوانە دەرنەکەیت کە پەروەردگاریان دەپەرەستن و داوای لێدەکەن بە بەیانیان ) تاکو دەگاتە ( فَتَكُونَ مِنَ الظَّالِمِينَ ) ( واتا : ئەوە لە ستەمکاران دەبیت )

فەرموویەتی : ئەقرەعی کوری حابیسی تەمیمی و عوەینەی کوری حیصنی فەزاری هاتن ، جا بینیان پێغەمبەر ( ﷺ ) لەگەڵ صوهەیب و بیلال و عەمار و خەبابایە ، لەگەڵ کۆمەڵێ لە هەژار و نەبووەکانی بڕواداران دانیشتووە ، جا کاتێک ئەوانەیان لە دەوری ( ﷺ ) بینی پێیان کەمی بوو بە کەم تەماشایان کرد ، جا ئەوان هاتن و وتیان : ڕاستی ئێمە دەمانەوێ کۆڕ و مەجلیسمان تایبەت بێت ، کە عەرەب بەو مەجلیسە پلەو پایەمان بەرز بزانن ، چونکە وەفدەکانی عەرەب کاتێک سەردانت دەکەن شەرم دەکەین کە عەرەب لەناو ئەو بەندەو کۆیلانەمان ببینێت ، جا کاتێک ئێمە هاتین ئەوان لەلای خۆت هەستێنە بڕۆن ، جا کە ئێمە لێبویبەوە ئەوە ئەگەر حەزت کرد لەگەڵیان دابنیشە ، فەرمووی : بەڵێ باش ، وتیان : کەواتە با نوسراوێکمان لەسەر ئەوە هەبێت ، ڕاوی فەرمووی : پێغەمبەر ( ﷺ ) داوای پەرەیەکی کرد و بانگی عەلی ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) کرد کە بینوسێت ، لەوکاتەدا ئێمە بۆخۆمان لە گۆشەیەک دانیشتبوین ، پاشان جبریل ( علیه سلام ) دابەزی و فەرمووی : ( وَلاَ تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَيْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ الظَّالِمِينَ ) ( الأنعام : ٥٢ ) ( واتا : وە ئەوانە دەرنەکەیت کە پەروەردگاریان دەرەستن و داوای لێدەکەن بە بەیانیان و ئێوارانیدا ڕەزامەندی اللهیان دەوێت و لێپرسینەوەی هیچ شتێکیان لەسەر تۆ نیە وە لێپرسینەوەی هیچ شتێکی تۆیش لەسەر ئەوان نیە جا ئەگەر دەریانبکەیت یان دوریان بخەیتەوە ئەوە لە ستەمکاران دەبیت ) .

پاشان باسی ئەقرەعی کوری حابیس و عویەینەی کوری حیصنی کرد و فەرمووی : ( وَكَذَلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوا أَهَؤُلاء مَنَّ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّن بَيْنِنَا أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ ) ( الأنعام : ٥٣ ) ( واتا : وە بەو جۆرە

هەندێکمان بە هەندێکی تریان تاقی کردەوە بۆ ئەوەی بڵێن ئایا ئەوانە اللە ڕێز و بەهرەی پێ بەخشیوون لە ناو ئێمەدا ؟ ئایا اللە لە هەموو کەس زاناتر نیە بەوانەی کە شوکرانە بژێرن ؟ ) .

پاشان فەرمووی : ( وَإِذَا جَاءَكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِنَا فَقُلْ سَلامٌ عَلَيْكُمْ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ ) ( الأنعام : ٥٤ ) ( واتا : هەرکات ئەوانەی کە بە نیشانەکانی ئێمە باوەر دەهێنن هاتن بۆلات ، پێیان بڵێ : سڵاوتان لێبێت و موژدەتان لێبێت کە بەراستی پەروەردگاری ئێوە بریاری داوە و نوسیویەتی لەسەر خۆی کە ڕەحم و سۆزی هەبێت بۆتان ) . راوی فەرمووی : ئێمەیش لێی نزیک بوینەوە تاکو چۆکمان خستە سەر چۆکی ، وە پێغەمبەر ( ﷺ ) لەگەڵ ئێمە دادەنیشت ، جا کاتێک بیویستایە هەستایە هەڵدەستا و بەجێی دەهێشتین ، پاشان اللە ئەو ئایەتەی دابەزان : ( وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ وَلا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ ) ( الكهف : ٢٨ ) ( واتا خۆت ڕاگرە لەگەڵ ئەوانەی لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە و یادی ئەو دەکەن و دەیپەرەستن بەیانیان و ئێواران کە مەبەستیان ڕەزامەندی اللّەیە چاوەکانت لەوان لامەدەو وەرمەگێرە ) .

وە لەگەڵ ئەو کەسانە دامەنیشە کە خۆیان پێ نەجیبزادەیە : ( تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَن ذِكْرِنَا ) ( الكهف : ٢٨ ) ( واتا : جوانی و ڕازاوەیی ژیانی ئەم دونیای دەوێ و بە گوێی کەسێک مەکە کە دڵیان لە یادی خۆمان بێ ئاگا کردوە ) .

راوى فەرمووى : مەبەستى ئايەتەكە عويەينەو ئەقرەع بوو ، ( وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا ) ( الكهف : ٢٨ ) ( واتا : وە شوێنى هەواو ئارەزوى خۆى كەوتوە هەموو كارەكانى خراپ و لە سنوور دەرچووە ) .

راوى فەرمووى : مەبەستى ئايەتەكە لە فەرمانەكە كارو فەرمانى عويەنەو ئەقرەع بوو .

پاشان نمونەى دو پياوەكەو نمونەى دونياى بۆ لێك دانەوە ، خەباب فەرمووى : پاشان كە لەخزمەت پێغەمبەر ( ﷺ ) دادەنيشتين هەركات گەشتبايە ئەو كاتەى كە پێغەمبەر ( ﷺ ) تێيدا هەڵدەستا ئێمە هەڵدەستاين و وازمان دێنا تاكو ئەو هەڵبستێت.

ابن ماجه ( ٤١٢٧ ) ، والطبرى ( التفسير ) ( ٩ / ٢٥٩ ) ، وە ابن كثير دەڵێ : ئەمە غەريبە ، چونكە ئەم ئايەتە مەككيە ، وە الأقرعى كورى حابس و عيينە موسوڵمان بوون دواى هيجرەت ( التفسير ) ( ٣ / ٢٦٠ )

محمدى كورى الحسين ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

شايستەترينى خەڵكى لە پەيرەوكردنى ئەمە ( واتا ئەم رەوشتانە ) لەدواى پێغەمبەر ( ﷺ ) ئەهلى قورئانە كاتێك دابنيشن لەبەر الله عزوجل خەڵكى فێرى قورئان بكەن .

٦٤- زازان ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

چومە ژورەوە بۆلاى ابن مسعود ( رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ) : بينيم هاوەڵانى خز و يەمينيە ( كە دەوڵەمەند و بازرگان بوون ) پێش من رۆشتبونە مەجليسەكەوە ، بانگم كرد ئەى عبدالله ، لەبەر ئەوەى من پياوێكى كوێرم ئەمانەت نزيك كردوەتەوە و منيش دورم ؟ فەرمووى : نزيكمى كردەوە

لەخۆی و نزیک بومەوە لێی تاکو ئەوکاتەی کە هیچ کەسێک لە بەینی من ئەودا نەبوو .

محمدی کوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

٦٥- حەز دەکەم گەر کەسێک هات قورئانی لەلا بخوێنێت چ منداڵ بێت یان گەنج بێت یان پیر ، سەرەتا هەر یەکێک لەمانە تاقی بکاتەوە پێش ئەوەی سورەتی بەقەرەیان پێ بڵێت ، تاقیان بکاتەوە تاکو بزانێت چیان لە قورئان لەبەر کردووە لە سورەتی فاتیحە تاکو ربع سبع ( سبع واتا حەوت یەک ، واتا قورئان بکە بە ٧ بەش ، ئینجا بەشێک لەم ٧ بەشە پێی ئەووترێ سبع ، ربع واتا چارەگ ، واتا چارەگی سبع ) یان زیاتر لەوە کە نوێژەکانی پێ ئەنجام ئەدات ، وە ئەکرێت پێشنوێژی پێ بکات گەر پێویستی کرد ، گەر ئەیزانی و لەلای مامۆستا قورئانخوێنەکان فێر کرابوو ، ئەوکات زمانی رێک و پاراو ئەکات ، تاکو بتوانێت فەرزەکانی پێ ئەنجام بدات ، پاشان دەست پێ دەکات بە فێر کردنی سورەتی بەقەرە .

وە پێم خۆشە ئەو کەسەی قورئانی بۆ دەخوێندرێتەوە چاک گوێی بۆ بگرێت بۆ ئەو کەسەی بۆی دەخوێنێتەوە ، خۆی مەشغوڵ نەکات بە قسەی ترەوە ، ئەوە ئەو کەسەی دەیخوێنێتەوە توشی خێر دەبێت ، بەهەمان شێوە ئەوەیشی بەسەریدا دەخوێندرێتەوە ، وە بیر لەو ئایەتانە بکاتەوە کە بۆی دەخوێندرێتەوە ، لەوانەیە گوێبیستنی لە قورئان کاتێک کەسێکی تر بۆی دەخوێنێتەوە سودی زیاتری پێ بگەیەنێت و پاداشتی گەورەی دەست بکەوێت ، الله عزوجل دەفەرمووێ ( وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُواْ لَهُ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ) ( الأعراف : ٢٠٤ )

( واتا : وە کاتێک قورئان خوێندرا دەبێ گوێی لێ بگرن وە بێدەنگ بن بۆ ئەوەی الله رەحمتان پێ بکات )

ئەگەر قسەی لەگەل کەس نەکرد تەنها گوێی بۆ قورئانەکە گرد ئەوە رەحمەتی اللّٰهی دەسدەکەوێت ، بەهەمان شێوە بۆ خوێنەرەکە .

وە پێغەمبەر ( ﷺ ) بە عبداللّٰهی کوری مسعودی ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) فەرموو : بخوێنە بەسەرمدا .

عبداللّٰهی کوری مسعود ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێیم وت : ئەی پێغەمبەر ( ﷺ ) ، من بخوێنم بەسەرتدا ، لە کاتێکدا بەسەر تۆدا دابەزیوە ؟!

فەرمووی : من پێم خۆشە لە جگە لەخۆم گوێم لێبێت .

٦٦- ابن مسعود ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ :

پێغەمبەر ( ﷺ ) پێی فەرمووم : بخوێنە بەسەرمدا ، وتم : ئایا من بخوێنم بەسەرتدا کە بەسەر تۆدا دابەزیوە؟

فەرمووی : من پێم خۆشە گوێم لێبێت جگە لەخۆم .

ابن مسعود ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) فەرمووی : سورەتی نیساء م خوێند ، کاتێک گەشتمە ( فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلاء شَهِيدًا ) ( النساء : ٤١ )

( واتا : پاشان حالی کافران چۆنبێت کاتێک هێنامان لە هەموو ئومەتێکدا شایەتێک ( کە پێغەمبەرەکەیانە ) تۆیشمان هێنا ئەی محمد ( ﷺ ) بە شایەت بەسەر ئائەوانەوە )

ابن مسعود ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) فەرمووی : بینیم چاوەکانی فرمێسکی لێ دەرژێت .

پاشان پێی فەرمووم : بەسە .

٦٧- وە پێم خۆشە ئەو کەسەی کە قورئان دەخوێنێت لە کاتی دەرسدا تەنها دەرسی یەک کەس بداتەوە ، وە نەبێت بە دوان ، ئەوا سودبەخشترە بۆ هەمووان .

وە خوێندنەوە بەسەر گشتیدا : هیچ کێشەیەک نیە ئەگەر بەسەر کۆمەڵدا بیخوێنێتەوە.

وە پێویستە هەرکەس کە قورئانی خوێندەوە ئەگەر هەڵەی کرد یان بەهەڵدا چوو ، نابێت توند بێت لەسەری ، وە پێویستە نەرم بێت لەگەڵیدا ، نابێت سارد بێت لەگەڵیدا ، وە سەبری لەسەر بگرێت ، لەبەر ئەوەی ئەگەر سارد بێت یان توند بێت لەسەری لەوانەیە رابکات ، ئەولاتریشە نەگەرێتەوە بۆ مزگەوت جارێکی دیکە ، وە ریوات کراوە لە پێغەمبەرەوە ( ﷺ ) کە فەرموویەتی : فێری خەڵکی بکەن و توند نەبن ، لەبەر ئەوەی فێرکەر چاکترە لەو کەسەی کە توندە .

وە فەرموویەتی ( ﷺ ) : ئێوە نێردراون بۆ ئەوەی ئاسانکاربن وە نەنێردراون بۆ ئەوەی توند بن .

٦٨- ابو هریرە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

فێری خەڵکی بکەن و توند نەبن ، لەبەر ئەوەی فێرکەر چاکترە لەو کەسەی کە توندە .

٦٩- ئەنەسی کوری مالک ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

ئاسانکاری بکەن و شتەکان قورس مەکەن ، وە رایانبگرن وە راویان مەنێن.

٧٠- عومەری کوری خطاب ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ :

فێری علم ببن ، وە لەگەڵ علمیشدا فێری هێمنی و لەسەرخۆی ببن ، وە خاکیبن لەگەڵ ئەو کەسانەی کە فێریان دەکەن ، ئەوانەیشی کە فێر دەبن با خاکی ببن ، وە مەبن بە خۆبەگەورەزانانی زانایان ، علمەکانتان جەهلەکانتان راست ناکاتەوە .

محمدی کوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

٧١- هەرکەس ئەمە رەوشتەکانی بێت ئەوا سود دەگەینێت بەوەی کە قورئان دەخوێنێت بەسەریدا ( واتا ئەوانەی کە لەلای دەخوێنن ) پاشان دەڵێم :

پێویستە لەسەر ئەوەی کە قورئان دەخوێنێت لە پێناو اللهدا عزوجل نەفسی خۆی بپارێزێت لەوەی پێداویستیەکانی دەست بخات لە رێگەی ئەوانەی کە قورئان دەخوێنن بەسەریدا ، وە نابێت بەکاری بهێنێت ، وە هەروەها نابێت ئەرک بکاتە سەریان کە پێداویستی بۆ ئەنجام بدەن .

من پێم باشە ئەگەر پێداویستیەکی هەبێت بیداتە ئەو کەسانەی کە لەلای قورئان ناخوێنن ، وە پێم خۆشە قورئان بپارێزێت لەوەی کە بەهۆی قورئانەوە پێداویستیەکانی بۆ ئەنجام بدات .

ئەگەر پێداویستیەکی هەبوو پێویستە داوا لە الله بکات کە بۆی ئەنجام بدات .

ئەگەر یەکێک لە براکانی دەسپێشخەری کرد و بۆی کرد وە بێ ئەوەی کە داوای بکات پێویستیە شوکری الله بکات لەسەر ئەوەی کە پاراستویەتی لە داوا کردن و زەلیل بوون بۆ ئەهلی دونیا ، وە الله کارەکەی بۆ ئاسان کردوە کە ئەنجام بدرێت ، پاشان پێویستە شوکری ئەوە بکات کە لەسەر دەسەکانی کارەکەی بۆ ئەنجام دراوە ئا ئەمە واجبە لەسەری .

ئەوەی کە باسم کرد هەواڵی زۆر لەبارەوە ریوایەت کراوە کە ئاماژە بەوە دەکات کە وتم .

وە منیش لەبەر ئەوە باسی دەکەم ئەو کەسەی کە سەیری کتێبەکانمان دەکات بینای زیاتربێت ان شاء الله .

٧٢- حەسەنی کوری رەبیعی بەورانی ( رحمە الله ) دەفەرمووێ :

من لەلای عبداللەی کوری ادریس بوم ، کاتێک هەستام ، پێی وتم : پرسیار بکە دەربارەی نرخی ئەشنان ( جۆرە گیایەکە کە بۆخۆشۆردن بەکار هێنراوە ) ، کاتێک هەستام و رێم کرد گەراندمیەوە ، وتی : پرسیار مەکە ، تۆ لای من فەرموودە دەنوسیت ، وە منیش رقم لێیە کە پرسیار لە کەسێک بکەم کە داوای پێداویستیەکی لێبەکەم کەلای من گوێبیستی فەرموودە دەبێت .

٧٣- خلفی کوری تمیم ( رحمە الله ) دەفەرمووێ :

باوکم مرد و قەرزاری لەسەر بوو ، چوم بۆلای حەمزەی زیات ( یەکێکە لە حەوت قاریئەکە ) پرسیارم لێ کرد کە داوا لە خاوەن قەرزەکە بکات کە شتێک لەو قەرزەی لەسەر باوکمە کەم بکاتەوە ، حەمزە فەرمووی :

هاوار بۆتۆ ، ئەوە قورئان دەخوێنێت بەسەرمدا ، وەمن رقم لێیە ئاو بخۆمەوە لەو ماڵەی کە کەسێکی تێدابێت کە قورئان بەسەرمدا بخوێنمەوە .

٧٤- فضیلی کوری عیاض ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

پێویستیە لەسەر هەڵگری قورئان کە پێویستی بە یەک کەس نەبێت لە خەڵکی ، وە پێویستیە پێداویستی خەڵکی بهێنرێت بۆلای .

٧٥- رەبیعی کوری ئەنەس ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

نوسراوە لە تەوراتدا : فێری خەڵکی بکە بە خۆرای چۆن فێرکراویت بە خۆرای .

٧٦- عبدالرحمانی کوری شبل ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

قورئان بخوێنن ، زێدەرەوی تێدا مەکەن ، سارد مەبنەوە لێی ، پێی مەخۆن ، وە لوت بەرز مەبن پێی .

٧٧- ابو هریرە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

هەرکەسێ زانستێکی شەرعی فێرببێت خۆی دەبێت مەبەست لە فێربونی لەبەر رەزامەندی الله عزوجل بێت ، بەڵام ئەم بۆ ئەوە خۆی فێر بکات شتێک لە ماڵ و سامانی دونیای دەستبکەوێت ، ئەو کەسە لە رۆژی قیامەتدا بۆنی بەهەشت ناکات .

٧٨- زازان ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

هەرکەسێ قورئان بخوێنێت و لە خەڵکی بخوات پێی ، رۆژی قیامەت دێت و دەموچاوی ئێسقانە و گۆشتی پێوە نیە .

٧٩- ضعیف عبداللهی کوری مسعود ( رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ :

ئەگەر ئەهلی علم علمیان بپاراستایە و لای ئەهلی علم دایان بنایە ، بەهۆی ئەوەوە دەبنە گەورەی خەڵکانی زەمانی خۆیان ، بەڵام دایانە ئەهلی دونیا ، بۆ ئەوەی دونیایان دەسکەوێت ، لای ئەهلی علم بێنرخیان کرد ، گوێم لە پێغەمبەرەکەتان بوو ( ﷺ ) دەیفەرموو : هەرکەسێک هەموو خەمەکانی بکاتە یەک خەم ، خەمیشی : دوارۆژ بێت ، الله خەمی دونیای لەکۆڵ دەکاتەوە ، وە هەرکەسێک خەمەکانی بوارەکانی دونیا سەرگەردانی بکات الله بەلایەوە گرنگ نیە لە هەر دۆڵێک لە دۆڵەکانی دونیا لەناو بچێت.

رونکردنەوە : ضعیفە چونکە سەنەدەکەی نشهل بن سعیدی تێدایە کە تۆمەتبار کراوە بە درۆزن ، وە العقیلی لە ضعفاء هێناویەتی ( ٤ / ٣٠٩ )

٨٠- عیسی کوری عمری نحوی ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

هاتم تا مامەوە لای حەسەن ، گوێم لێیبو دەیفەرموو : سێ پیاو ئەم قورئانە دەخوێننەوە .

پیاوێك دەیخوێنێتەو کۆمەلە کەلوپەلێکی پێ بەدەست دێنێ و دەیگوازێتەوە لە شارێک بۆ شارێکی تر .

وە پیاوێك دەیخوێنێتەوە دەوەستێ لەسەر پیتەکانی و وە سنورەکانی دەبەزێنێت ، وە دەڵێ من واللە یەك وشەش کەمناکەم لە قورئان ، الله عزوجل گۆڕەکان زیاد بکات بەمانە ، وە ماڵەکانیان پێ چۆڵبکات ، وە والله

ئەمانە خۆبەگەورەزانیان زیاترە لە خاوەنانی کورسی لەسەر جێگاکەی ، وە لە خاوەنانی مینبەر لەسە مینبەرەکەی.

وە پیاوێک قورئانی خوێندەوە و شەوەکەی بەمە بەسەر برد ، وە ڕۆژەکەی بە ڕۆژوو بوو ، بەهۆی ئەمانە لەشەهوەت پارێزراوبوو ، وە گریا لە ژێر جلەکانی (گریانێك کەوا دەنگی نەبێت ) ، وە لە جەنگ وەستا (یانی کاتێك جیهاد هاتبوایە ئامادەبوو ) بەمانە اللە دوژمنەکانمانی لەناو برد ، وە بەهۆی ئەمانەوە ئاوی بارانەکانی پێداین ، وە لەم جۆرە لە قورئان خوێنەکان بەهێزترن لە کیبریتی سور ( وتراوە : یاقوتی سورە ، یاخود ئاڵتونی سورە ، یاخود ئەڵماسە ( لسان العرب ٥ / ٤٥ ) .

محمدی کوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

ئەو هەواڵانەی لەم واتایەوە هاتووە زۆرن ، وە مەبەستم لەم ئامۆژگاریە بۆ ئەهلی قورئان ئەوەیە کە هەوڵدانیان پوچەڵ نەبێتەوە ، ئەگەر داوای شەرەفی دونیا بکەن ( واتا ئەو شتانەی کە بەهۆیەوە شەرەفمەند دەبن لە دونیادا ) لەسەریان حەرامدەکرێت شەرەفی دوارۆژ ، کاتێک بێنرخیان کرد لەبەر ئەهلی دونیا وەکو تەماحێک بۆ دونیایان ، اللە هەڵگرانی قورئان لەوە بپارێزێت .

پێویستە هەرکەس دانیشێت و موسوڵمانان فێر بکات ( یان بخوێنێت ) خەڵکی فێری ئەدەب بکات بە ئەدەبی قورئان ، وە داوای خێرەکەی لە اللە بکات ، وە قورئان بەسی بێت لە جگە لەخەڵکی ، لە نەفسی خۆیدا خاکیبێت بۆ ئەوەی لەلای اللە بەرز بکرێتەوە .

٨١- حەمادی کوری زید ( رحمه الله ) دەفەرمووێ : گوێم لە ایوبی سخستیانی ( رحمه الله ) بوو فەرمووی :

پێویستیە زانا خۆڵەکەوە ( ئەو تۆز و وردە خۆڵانەی کە لە ئاگر دەمێنێتەوە ) لەسەر خۆی دابنات بۆ ئەوەی خاکیبێت لەبەر الله عزوجل .

## باب ( ٧ )

## باسی ئەخلاقی ئەوەی کە دەخوێنێت بەسەر قورئان خوێندا ( بابی پێشوو ئیمام باسی ئەخلاقی مامۆستای کرد لەم بابەدا باسی ئەخلاقی تەلەبە دەکات )

محمدی کوری الحسين ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

٨٢- هەرکەسێک لەلای کەسانی تر خوێندی قورئان وەربگرێت وە پێویستە لەسەری جوانترین ئەدەب بنوێنێت لە کاتی دانیشتن لایدا ، وە خاکی بنوێنێت لە دانیشتنەکەیدا ، وە خاکی بنوێنێت و روی لەو بێت ، ئەگەر لێیتورەبوو ئەوا تەحەمولی بکات ، وە ئەگەر توند بوو لەسەری با بەرگەی بگرێت و نەرم و نیانبێت لەگەڵیدا ( واتا لەگەڵ مامۆستاکەی ) پێی وابێت ئەمە گەورەییە بۆ مامۆستاکەی ، هەروەها شەرمیشی لێبکات .

وە پێم خۆشە ئەوانە وەربگرێت کە دەزانێت بەجوانی دەیخوێنێت ، ئەو زاناترە بە نەفسی خۆی ، ئەگەر زانی لەکاتی وەرگردندا زیاتر لە پێنج ( ئایەت ) وەرناگرێت ( واتا مێشکی وەری ناگرێت و ئاستی پێنج ئایەتی هەیە ) ئەوا با پێنج وەربگرێت ، وە پێویست ناکات داوای زیاتر بکات.

وە ئەگەر زانی بەرگەی زیاتر لە سێ ئایەت ناگرێت با داوای پێنج نەکات ، وە ئەگەر مامۆستاکەی سێ ئایەتی پێدا لەوەیش زیادی نەکرد وە ئەو زانی

که بەرگەی پێنج دەگرێت وە داوای لێکرد کە زیادی بکات بۆی با بە نەرمترین شێواز داوا بکات ، وە ئەگەر نەیهێڵا مامۆستاکەی ئەوا با بەداواکردنەکەی ئازاری نەدات ، وە ئارام بگرێت لەسەر مەبەستی مامۆستاکەی ، لەبەر ئەوەی ئەگەر ئەوە بکات ئەوا ئەم کارە سەردەکێشێت بۆ ئەوەی کە زیادی بکات بۆی لە داهاتودا ان شاء الله .

وە نابێت بێزاربێت لەو کەسەی کە دەرسی دەدات دەبێت زوهدی هەبێت ، وە ئەگەر دەرسی پێوت سوپاسی بکات ، وە دوعای بۆ بکات ، وە ڕێزی بگرێت .

وە نابێت سارد و سر بێت ئەگەر ئەو سارد و سر بوو لەگەڵیدا ، وە ڕێز لەو کەسە بگرێت کە دەرس پێ دەڵێتەوە هەرچەندە ئەو ڕێزیشی نەگرد ، وە شەرمی لێبکات هەرچەندە ئەو شەرمی لێنەکات ، وە پێویستە خۆت پەیوەست بکەیت و پێویستە حەقی بدەیت ، ئەولاترە ئەویش حەقی تۆ بزانێت ، لەبەر ئەوەی ئەهلی قورئان ئەهلی خێرن و بەئاگایی و ئەدەبن ، حەقی ئەو شتە دەزانن کە لەسەریانە ، وە هەرچەندە بێئاگابێت لە واجبێک لەسەری کە حەقی تۆیە ، تۆ بێئاگا مەبە لەو حەقانەی کە واجبە لەسەرت ، لەبەر ئەوەی الله عزوجل فەرمانی پێ کردوی کە حەقی خەڵکی بزانیت وە ئەمری پێ کردوی گوێرایەڵی زانایان بیت ، وە هەروایش پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمانی کردوە .

٨٣- منقطع ابو قبيل المعافرى دەفەرمووێ : عبادەی کوری صامت ( رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ) فەرمووی : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

لە ئومەتەم نیە هەرکەس ڕێز لە گەورە نەگرێت ، ڕەحم بە بچوک نەکات ، وە زانایان بناسێت .

احمدی کوری عیسی ( رحمه الله ) دەفەرمووێ : واتا : حەقیان بناسێت .

منقطعه چونکه ابو قبیل گوێی له عباده نەبووە .

٨٤- سعدی ساعدی ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

پەروەردگارم مەمگەیەنە بە زەمانێک وە نەگەم پێیشی کە تێیدا دوای زانا ناکەون و تێیدا شەرم لەلەسەرخۆ ناکرێت ( واتا ئینسانی هێمن و لەسەخۆ ) ، دڵەکانیان دڵی بیانین ، وە زمانیان زمانی عەرەبە .

٨٥- ابی سلمه ( رحمه الله ) کە کوری عبدالرحمانی کوری عەوفە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ :

ئەگەر هاورێیەتی ابن عباسم ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) بکردایە ، ئەوە علمەکانم لێوەردەگرت .

٨٦- ليث ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

مجاهد ( رحمه الله ) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا : ( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللَّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ ) ( النساء : ٥٩ )

( واتا : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە گوێڕایەڵی الله و پێغەمبەرەکەی بکەن و پاشان گوێڕایەڵی کاربەدەستەکانتان بکەن )

فەرمووی : فەقیهەکان و زاناکانن .

٨٧- لە ابراهیمەوە بە هەمان شێوە .

محمدی کوری الحسين ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

٨٨- پاشان پێویستە لەسەر هەرکەسێک کە مامۆستاکەی دەرسی پێداوە تێنەپەڕێت لەوەی کە پێی دراوە ، ئەگەر پێی خۆشبوو کە دەرسی پێ بوترێتەوە ( واتا حەز بکات زیاتری پێ بدات بەڵام ئەوەی کە مامۆستاکەی پێی داوە لەوە زیاتر نەخوێنێت ) وە ئەگەر لای کەسێکی دیکە دانیشت دەرسی دیکەی لێوەرنەگرێت ئیلا ئەوە نەبێت کە مامۆستاکەی پێی وتووە ، واتا : حەرفێک نەبێت جگە لەو حەرفانەی کە مامۆستاکەی پێی وتووە ، چونکە ئەوەیە کە لەسەری راهاتووە ، وە راسترە بۆ خوێندنەوەکەی ، وە پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرموویەتی : بخوێنن وەکو چۆن فێرکراون .

٨٩- ابن مسعود ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ :

بە پیاوێکم وت قورئان بخوێنە لە سورەتی الأحقافەوە سی ئایەت بخوێنە ، ئەویش بۆی خوێندم بەڵام پێچەوانەی ئەوەی کە پێغەمبەر ( ﷺ ) فێری کردبوین ، پاشان بە کەسێکی دیکەم وت سی ئایەت بخوێنە لە سورەتی الأحقاف ، بەهەمان شێوە ئەویش بە پێچەوانەی ئەوە خوێندیەوە بۆم کە پێغەمبەر ( ﷺ ) خوێندبویەوە ، منیش ئەوانم هێنا بۆلای پێغەمبەر ( ﷺ ) ، ئەویش تورەبوو ، وە عەلی کوری ابی طالب ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دانیشتبوو ، فەرمووی : بخوێنن وەک چۆن فێرکراون .

٩٠- عبداللّٰهی کوری مسعود ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ :

پێغەمبەر ( ﷺ ) سورەتێکی بۆم خوێندەوە دوای ئەوە چومە مزگەوتەوە ، وتم : لەنێوتاندا کەسێک هەیە بخوێنێت ، پیاوێک لە هۆزەکە وتی : من ، ئەو سورەتەی بۆ خوێندمەوە کە پێغەمبەر ( ﷺ ) بۆی خوێندمەوە ، ئەو دەیخوێندەوە بە پێچەوانەی ئەوەی پێغەمبەر ( ﷺ ) بۆی خوێندمەوە ، رۆشتین بۆلای پێغەمبەر ( ﷺ ) ، وتمان : ئەی پێغەمبەر ( ﷺ ) ، راجیاواز

بوین له خوێندنەوەکانماندا ، دەموچاوی پێغەمبەر ( ﷺ ) گۆڕا ( واتا توڕە بوو ) ، على ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) فەرمووی : پێغەمبەر( ﷺ ) فەرموویەتی : بەڕاستی قەومانی پێش ئێوە لەناوچون بە ڕاجیاوازی ، با هەریەک لە ئێوە بخوێنێت بەوەی کە من دەیخوێنم بیخوێنێت ( واتا هەمووی تەواوە ) .

محمدی کوری الحسين ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

٩١- هەرکەسێک قەناعەتی بە دەرسی مامۆستاکەی هەبوو وە با لەوە زیاتر نەڕوات ، باشتر وایە بەردەوام بێت لەسەری .

ئەگەر بینی کە تەلەبەکەی لە شتێک تێدەگات کە ئەو تێناگات واز لە تێگەیاندنی دێنێت ( واتا واز لەوە دێنێت کە دەرسی پێ بڵێت ) وە لەسەری قورس دەبێت کە دەرسی پێ بڵێت ، ئەمەیش عاقیبەتەکەی باش و ستایش کراو نابێت .

وە پێم خۆشە ئەگەر قورئانی خوێند بەسەر مامۆستاکەیدا با نەیپچڕێنێت تاکو مامۆستاکەی پێی دەپچڕێنێت ، ئەگەر پێویستیەک لێیوە دەرچوو وە مامۆستاکەی مەبەستی ئەوەبوو کە سەد ئایەتی بۆ بخوێنێتەوە وە ئەم پەنجا ئایەتی هەڵبژارد با پێش ئەوە ئاگاداری بکاتەوە بەوەی کە عوزری هەیە ، تاکو مامۆستاکەی قورئانەکەی پێ بچڕێنێت ( لە پەنجا ئایەتەکەدا ).

وە پێویستە تەنها لەو کەسە وەربگرێت کە دەرسی پێدەڵێتەوە ، وە لە کەسانی جگە لەو وەرنەگرێت ، وە ئەگەر مامۆستاکەی مەشغوڵ بوو ئەوە پێویستە خوێندنەوەکەی بپچڕێنێت تا ئەوکاتەی مامۆستاکەی دەگەڕێتەوە و گوێبیستی دەبێت .

وه پێم خۆشه ئەگەر خوێندنەوەکەی لای مامۆستاکەی تەواوبوو وه لە مزگەوت بوو ، وه حەزی کرد بڕوات با بڕوات بە هێمنی ، وه لە ڕێگای چونەوەی ئەوەی کە خوێندویەتی با دوبارەی بکاتەوە .

وه ئەگەر پێی خۆشبوو با دانیشێت لە جگە لەخۆی کردەوەیەک وەربگرێت ( واتا خوێندنەوەی قورئانەکە کە کەسێکی دیکە بۆی بخوێنێتەوە و گوێبیستی بێت )

وه ئەگەر لە مزگەوت دانیشت و کەس ئامادە نەبوو کە قورئانی لێوەربگرێت :

ئەوا با نوێژ بکات خێری دەسدەکەوێت .

یاخود زکری الله تعالی بکات و شوکری بکات لەسەر ئەوەی کە فێری کردوه لە کتێبەکەی .

یاخود با دابنیشێت و نەفسی خۆی بگرێت ، خراپە بۆی دەرچێت ( واتا لە مزگەوت ) ، لە ترسی ئەوەی کە چاوی بکەوێتە سەر شتانێک کە حەلال نەبێت ، یاخو تێکەڵبون لەگەڵ کەسانێک کە باشنەبێت تێکەڵیان بێت لە مزگەوت ، حوکمەکەی ئەوەیە کە لە مزگەوت دابنیشێت و تەداخول شتانێک نەکات کە پەیوەندی بەوەوە نیە ، وه بترسێت لەوەی کە بکەوێتە نێو شەرەفی خەڵکی ، وه ئاگاداربێت لەوەی کە نەکەوێتە ناو باسو خواسەکانی دونیا و قسەی هیچ و پوچ ، چونکە لەوانەیە نەفس حەزی بێت بەو شتانەی کە باسم کرد کە هیچ سودێکی نیە ، وه عاقیبەتەکەی هەیە کە سوپاس نەکراوە.

با ئەخلاقی شەرەفمەندانە لە کاتی ئامادەبون و ڕۆشتنیدا بەکار بهێنێت کە شێوەی ڕەوشتی ئەهلی قورئان بدات ، وە الله تەوفیت بەخشە بۆ ئەو شتە.

# باب ( ٨ )

# ئەدەبی قورئان خوێنەکان لە کاتی خوێندنەوەی قورئان کە لەلای جاهیلەکان نیە ( واتا ئەم ڕەوشتانە )

محمدی کوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

٩٢- پێم خۆشە هەرکەسێک ویستی قورئان بخوێنێت لە شەو یان لە رۆژە : ئەوا با دەستنوێژ بگرێت ، وە سیواکیش بکات ، چونکە ئەمە گەورەدانانە بۆ قورئان ، لەبەر ئەوەی وتەی پەروەردگار عزوجل دەخوێنێتەوە ، وە لەبەر ئەوەیش مەلائیکە لێی نزیک دەبێتەوە لە کاتی قورئان خوێندن ، وە مەلائیکە لێی نزیک دەبێتەوە ئەگەر سیواکی کردبوو دەم لە دەمیەوە نزیک دەکاتەوە ، هەموو جارێک کاتێک ئایەتێک دەخوێنێت مەلائیکەکە لە دەمیەوە دەیبات ، وە ئەگەر سیواکی نەکردبوو مەلائیکە لێی دوردەکەوێتەوە ، نابێت ئەی ئەهلی قورئان وابکەن مەلائیکە لێتان دوربکەوێتەوە ، رەوشتی جوان بەکاربهێنن ، چونکە هەریەک لە ئێوە پێی ناخۆشە لەگەڵ براکانیدا دابنیشێت ئەگەر سیواکی نەکردبێت .

وە پێم خۆشە کە قورئان لە مصحفدا بخوێندرێتەوە لەبەر ئەوەی فەزل و چاکەی زیادەی هەیە بۆ ئەو کەسەی لەسەر مصحف دەخوێنێت ( چونکە ئەندامی چاوو دەستیش بەشدار دەبێت لە کاتی قورئان خوێندندا لەسەر مصحف ) .

وه نابێت قورئان بەدەستەوە بگرێت تەنها ئەوە نەبێت کە دەستنوێژی هەیە.

ئەگەر پێی خۆشبوو لەسەر مصحف بخوێنێت و دەسنوێژی نەبێت کێشە نیە بخوێنێت بەڵام با دەستی لێنەدات و لاپەڕەکان بە شتێک ئەملا و ئەولا پێبکات ، وە با دەستی لێ نەدات تەنها بەدەسنوێژەوە نەبێت .

وە پێویستە لەسەر قورئان خوێن کاتێک قورئان دەخوێنێت ئەگەر بایەکی لێوە دەرچوو با لە قورئان خوێندن بوەستێت تاکو ئەوکاتەی بایەکەی لێوە دەردەچێت بە تەواوی ، وە ئەگەر پێی خۆشبوو دەسنوێژ بگرێتەوە پاشان قورئان بخوێنێت ئەوە باشترە ، وە ئەگەر بەبێ دەستنوێژ خوێندی ئەوا کێشەی نیە .

وە ئەگەر باوێشکی دا و قورئانی دەخوێند با دەمی بگرێت تاکو کۆتای پێدێت .

وە با قورئان نەخوێنێت لە کاتی لەشگرانیدا ( وە بەهەمان شێوە سوری مانگانە بۆ ئافرەتان ) ، نابێت ئایەتێک یان حەرفێک بخوێنێت .

وە ئەگەر تەسبیحی کرد ( سبحان الله ) یاخود حەمدی کرد ( الحمدلله ) یاخود بەگەورەی دانا ( الله اکبر ) ، یاخود بانگی دا کێشەی تێدا نیە .

وە پێم خۆشە قورئان خوێن لە کاتی سوجدەکانی قورئاندا بەهەرسوجدەیەکدا تێپەری با سوجدە ببات وە لە قورئانیشدا پازدە سوجدە هەیە .

وتراوە : چواردەیە .

وتراويشه يازدەيه .

ئەوەيش كه هەڵى دەبژێرم ئەوەيه با سوجده ببات هەركاتێک به سوجدەيەک تێپەرى لەبەر ئەوەى رەزامەندى پەروەردگارى بەدەست دەهێنێت و دوژمنى الله شەيطان تورە دەكات .

٩٣- وه ريوايەت كراوه له ابى هريرەوه ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووى :

ئەگەر ابن آدم قورئانى خوێند گەشته سوجدەيەک و سوجدەى برد ئەوا شەيطان خۆى جيادەكاتەوه و دەگريەت ( واتا رادەكات ) ، دەڵێت : وەيل بۆ من ، فەرمان به ابن آدم كرا بەسوجدەو سوجدەى برد و بەهەشتى بۆ هەيه ، وه منيش فەرمانم پێ كرا به سوجدەو نەمكرد و ئاگر بۆ من هەيه .

٩٤- وه پێم خۆشه هەركەسێک ديراسەى قورئان دەكات وه بەرێگادا رێى دەكرد ، گەشته سوجدەيەک با رو له قيبله بكات و بەسەرى ئيشارەت بكات ( واتا به سەرى ئيشارەت بۆ سوجدەكه بكات و بەرەو خوارى بكاتەوه ) ، وه بەم شێوەيەش ئەگەر بێتو سوارچاک بوو ، وه ديراسەى قورئانى كرد گەشته سوجدەيەک با رو له قيبله بكات و سەرى بجولێنێت ئەگەر توانى .

وه پێم خۆشه هەركەسێک دانيشتبوو قورئانى دەخوێند با رو له قيبله بكات ئەگەر توانى ، ئەميش بەهۆى وتەى پێغەمبەر ( ﷺ ) كه فەرموويەتى : باشترين مەجليسەكان ئەوەيه كه رو له قيبلەيه .

( ئەم فەرموودەيه ضعيفه وه له ئاثارى ٥٩ رونكردنەوەم لەسەرى داوه )

وە پێم خۆشە هەرکەسێک کە قورئان دەخوێنێت با بە خەمگینەوە بیخوێنێت ، وە بگریەت ئەگەر توانی ، وە گەر نەیتوانی با خۆی بگریەنێت ( واتا تێبفکرێت و بگریەت نەوەک بە درۆوە خۆی بگریەنێت ) .

وە پێم خۆشە لە کاتی قورئان خوێندنەکەیدا بیربکاتەوە ، وە ورد ببێتەوە لەوەی دەیخوێنێت ، وە وازبهێنێت لەو شتانەی کە دڵی بەلارێدا دەبات ، وە واز لە هەموو کارێک بهێنێت تاکو ئەو کاتەی کە دەرسەکەی تەواو دەکات ، وە خۆشەویسترە لەلای من کە بە تێگەیشتنەوە بیخوێنێت ، وە سەرقاڵ نەبێت بە قسانێک جگە لە قسانی پەروەردگار .

وە پێم خۆشە گەر دیراسەی قورئانی کرد و بە ئایەتێک گەشت با داوا لە پەروەردگاری بکات ( واتا داوای رەحمەت ) ، وە گەر گەشت بە ئایەتێکی سزا ئەوا با پەنا بە الله عزوجل بگرێت لە ئاگر ، وە ئەگەر گەشت بە ئایەتێک پاکی و بێگەردی بوو بۆ الله عزوجل لەو شتانەی کە ئەهلی کوفر وتویانە با تەسبیحی الله بکات و بە گەورەی بزانێت .

وە ئەگەر قورئانی خوێند و خەو گرتی ، حوکمی وایە کە خوێندنەوەکەی بپچڕێنێت تا ئەوکاتەی کە هەڵدەستێت ( واتا بخەوێت تا ئەوکاتەی هەڵەسێت پاشان قورئان بخوێنێت ) ، لەبەر ئەوەی کاتێک دەخوێنێت با ئاگای لەوەبێت کە دەیخوێنێت .

محمدی کوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

هەموو ئەوانەی کە فەرمانم پێ کردن بۆ قورئان موافەقەی سوننەت وتەی زانایانە ، منیش ئەوانەتان بۆ باس دەکەم کە ئامادەن لەلام ان شاء الله .

٩٥- مرسل له زهريەوه ( رحمه الله ) كه تابعيه دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرموویەتی :

هەرکەس لە ئێوە گەر سیواکی کرد و پاشان هەستا و قورئانی خوێند ، ئەوا بە مەلائیکە دەوردەدرێت و گوێبیستی قورئان دەبن ، تا ئەوکاتەی کە دەمیان نزیک دەکەنەوە لە دەمیەوە ، هەر ئایەتێک لە دەمیەوە دەردەچێت ئیلا دەچێتە دەمی مەلائیکەیەک ، وە گەر هەستا و قورئانی خوێند و سیواکی نەکرد بە مەلائیکە دەور دەدرێت بەڵام دەمیان لە دەمی نزیک ناکەنەوە .

٩٦- عبدالرحمن السلمی ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

علی ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) زۆری لێ دەکرد ، ئەمری پێ دەکرد - واتا : بە سیواک ، وە دەیفەرموو : ئەگەر کەسێک هەستا و نوێژی کرد مەلائیکە لێی نزیک دەبێتەوە و گوێبیستی قورئان دەبێت ، ئەوەندە لێی نزیک دەبێتەوە تاکو دەمی لە دەمیەوە نزیک دەکاتەوە ، هەر ئایەتێک کە دەیخوێنێت ئیلا دەچێتە ناو جەوفیەوە ( جەوف بۆشای دەم و قورگ و سنگ دەگرێتەوە والله اعلم ) .

٩٧- ابو محمد عبدالله بن العباس الطيالسى ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

اسحاقی کوری الکوسج ( رحمه الله ) فەرمووی : بە احمدی کوری حنبلم وت ( رحمه الله ) : دەربارەی خوێندنەوەی قورئان بەبێ دەسنوێژ ؟

فەرمووی : کێشەی تێدا نیە ، بەڵام ناخوێندرێتەوە لەسەر مصحف ئیلا بەدەسنوێژەوە نەبێت .

اسحاق ( رحمه الله ) - واتا : ابن راهويه -: دەفەرمووێ : ئەوە سوننەتە لەلای هەموومان .

٩٨- ابو بكر المروذى ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

ابو عبدالله ( واتا ئیمامی احمد ) قورئانی خوێندوە لەسەر مصحف و بەبێ دەسنوێژ دەستی پێوە نەدا ، بەڵام بەدەستیەوە دارێک بووە یان شتێک کە پەرەکانی پێ ئەملا و ئەولا پێ کردوە .

٩٩- ابن عيينه ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

زازان ( رحمه الله ) فەرمووی : بە عطاءم ( رحمه الله ) وت : هەندێ کات قورئان دەخوێنم بام لێ دەبێتەوە ، فەرمووی : بوەستە لە خوێند تاکو تەواو دەبێت .

١٠٠- مجاهد ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

ئەگەر قورئانت خوێند و باوێشکت دا بیگرە ( واتا دەمت ) ، تا ئەوکاتەی کە نامێنێت .

١٠١- لە عائیشەوە ( رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

ئەگەر هەرکەسێک لە ئێوە باوێشکی دا با پالبکەوێت ( واتا بخەوێت ) ، چونکە هەرکەس لە ئێوە بیەوێت داوای لێخۆشبوون الله بکات ئەوا لەجیاتی جوێن بە خۆی دەدات ( واتا دوعای شەر لەخۆی دەکات ) .

١٠٢- عبداللەی کوری سلمه ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

چومە ژورەوە بۆلای علی کوری ابی طالب ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەیفەرموو : پێغەمبەر ( ﷺ ) هیچ شتێک رێگری لەو نەدەکرد لە قورئان خوێندن جگە لە لەشگرانی .

رونکردنەوە : ضعتف الترمذی ( ١٤٦ ) وە ضعیف ابو داود ( ٢٢٩ )

وە الترمذی ( رحمه الله ) دەفەرمووێ : پیاو بۆی هەیە بەبێ دەستنوێژ قورئان بخوێنێت ، بەڵام لەناو مصحف خۆیدا هەر دەبێ دەستنوێژی هەبێت ، پێشەوایان لە سوفیان و شافعی و احمد و اسحاق وادەفەرموون.

١٠٣- ضعیف ابن عمر ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی:

کەسی لەشگران و ئافرەتێک لە سوری مانگانەدا بێت نابێت هیچ شتێک لە قورئان بخوێنێت .

رونکردنەوە : ابو حاتم الرازی ( رحمه الله ) دەفەرمووێ : ئەمە هەڵەیە ، بەڵکو ئەمە وتەی ابن عمره ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) ، ( علل الحدیث ) ( ١١٦ ) .

وە سەنەدەکەی اسماعیلی کوری عیاشی تێدایە ئیمامی احمد دەفەرمووێ : منکره ، ( العلل ومعرفه الرجال ) ( ٥٦٧٥ ) .

وە الترمذی بە منکر هێناویەتی ( ١٣١ )

محمدی کوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

١٠٤- هەموو ئەوانەی کە باسم کرد پێویستە لەسەر ئەهلی قورئان ئەدەبی پێ وەربگرن ، وە هەروەها بێئاگا نەبن لێی ، ئەگەر لە خوێندنەوەی قورئان تەواو بوون با پەندی لێ وەربگرن و محاسەبەی خۆیان بکەن لەسەری ،

ئەگەر بۆیان رونبەوەوە با قبوڵی ئەو شتانە بکەن کە پەروەردگاریان ئاگاداری کردونەتەوە بەو شتانەی کە واجبە لەسەریان و جێبەجێی فەرزەکانی بکەن ، وە لە حەرامەکان خۆیان بپارێزن ، سوپاسی بکەن لەسەر ئەوە ، وە شوکری الله عزوجل بکەن لەسەر ئەو شتانەی کە تەوفیقی داون لەسەری .

وە ئەگەر زانیان نەفسیان ئەو شتانە رەت دەکاتەوە کە پەروەردگاریان ئاگاداری کردونەتەوە لێی و بە کەمی گرنگی پێ دەدەن ؛ با داوای لێخۆشبون بکەن لە الله عزوجل لەو شتانەی کە کەمتەرخەمیان تێدا کردوە ، وە داوا بکەن لە الله کە حالیان بگۆرێت لەم حالەوە خراپەوە شیاوی ئەهلی قورئان نیە ، بیگۆرێت بۆ ئەو حالەی کە توشی رەزامەندی پەروەردگاریان دەبن ، لەبەر ئەوەی الله ناپیچرێنێت کاتێک بەرەو لای دەچن ، هەرکەسێک ئەمە حالی بێت ئەوا خوێندنەوەی قورئانەکەی سودی پێ دەگەینێت لە هەموو کارەکان ، وە بەرەکەتی قورئان دەگەرێتەوە سەری کە هەموو ئەو شتانەی کە حەزی کێیە لە دونیا و ئاخیرەتدا ان شاء الله تعالی.

١٠٥- قتادە ( رحمە الله ) دەفەرمووێ :

هیچ کەسێک نیە کە دابنیشێت و ئەم قورئانە بخوێنێتەوە ئیلا هەڵدەستێت یان شتێکی زیاد کردوە یاخود لێی کەمبووە ( واتا یان پاداشتی دەسدەکەوێت یان توشی خەسارەتمەندی دەبێت ) ، ئەوەیش ئەو بریارەیە کە الله بریاری لەسەر داوە : ( شِفَاء وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلاَ يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إَلاَّ خَسَارًا ).

( واتا : شیفا و ڕەحمەتە بۆ بڕواداران وە ئەو قورئانە پیرۆزە هیچ شتێک بۆ ستەمکاران زیاد ناکات لەبەر ئەوەی بە درۆیان زانیوە ئیلا زەرەرمەندی و بە هیلاک چون نەبێت )

١٠٦- لە سەعیدەوە ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

قتادە ( رحمه الله ) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ( وَالْبَلَدُ الطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُ بِإِذْنِ رَبِّهِ ) ( الأعراف ( ٥٨ ) ( واتا : زەوی خاکی پاک و بەپیت ڕووەک و شینایيەکەی بەفەرمانی پەروەردگاری دەروێت )

دەفەرمووێ : : ئیمانداره ، گوێبیستی کتابی الله عزوجل دەبێت لێیتێدەگات ، وە دەیبات ( واتا ئەحکامەکانی ) وە سودیشی پێ دەگەینێت ، نمونەی وەکو ئەم زەویەیە کە باران لێی دەدات و گیای تێدا سەوزدەبێت و زۆردەبێت ( وَالَّذِي خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا ) ( الأعراف : ٥٨ ) ( واتا : وە ئەوەی پیس و بێخێرە درک و دال نەبێ لێی ناروێ و دەرنایە )

واتا : ئیلا قورسی ، وە ئەمە نمونەی کافرە ، کاتێک گوێبیستی قورئان دەبێت بیری لێ ناکاتەوە ، وە نایشیبات ، وە سودیشی پێ ناگەیەنێت ، نمونەی وەکو ئەم زەویە پیسەیە بارانێکی لێزەمە لێیدەدات هیچ گیایەکی کێ سەوز نابێت ، وە زیادیش نابێت.

## باب ( ٩ )

## دەنگ خۆشی لە قورئاندا

١٠٧- لە اسماعیلی کوری عبداللهوە ، لە فضالەی کوری عبید ( رحمە الله ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرموویەتی :

الله تبارک وتعالی لەو خاوەنی ئەو کەنیزەکە گۆرانی بێژەی کە گۆرانی ئەڵێ بۆ خاوەنەکەی زیاتر دەیەوێ قورئان ببیستێ بە دەنگی خۆشی پیاوێک کە قورئانی پێ دەخوێنێتەوە ، ( واتە بە دەنگە خۆشەکەی ) .

الأوزاعی ( رحمە الله ) دەفەرمووێ : بیبیستێ واتا : استماعا .

رونکردنەوە : استماع واتا : بیستنێک کە خاوەنی بیستنەکە بیەوێت بیبیستێت ، لە کوردی خۆمان تەنها وشەی گوێ گردن بەکار دێت ، بەڵام گوێ بۆ الله ثابت نەکراوە ، بۆیە وشەیەک نیە بۆ تەرجومە کردنی استماع ، تەنها وشەی سمع تەرجومە کراوە واتا بیستن ، والله اعلم ، وە منقطعە چونکە اسماعیل نەگەشتووە بە فضالە.

١٠٨- لە بەرائی کوری عازبەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

قورئان برازێننەوە بە دەنگەکانتان .

١٠٩- لە صالحی کوری احمدی کوری حنبلەوە ( رحمە الله ) دەفەرمووێ :

پرسیارم له باوکم کرد ، دەربارەی وتەی پێغەمبەر ( ﷺ ) که فەرموویەتی : قورئان برازێننەوە وبکەن به دەنگەکانتان ، واتا چی ؟

فەرمووی : رازاندنەوە : چاکی بکەیت ( واتا پیت و حەرفەکانی به جوانی دەربربریت ) .

محمدی کوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

١١٠- پێویسته هەرکەسێک که الله دەنگی خۆشی پێبەخشیوه له قورئاندا با بزانێت که الله تعالى تایبەتمەندی کردوه بەخێرێکی گەوره ، با قەدری ئەو تایبەتمەندیه بگرێت که الله پێی بەخشیوه ، با بۆ الله بیخوێنێت نەک بۆ دروستکراوەکانی ، وه با حەزەر بکات لەوەی که مەیلی بێت بۆ ئەوەی که کەسانێک گوێی لێ بگرن که ئارەزومەندن بۆ دونیا ، وه مەیلی بێت بۆ ئەوەی که وەسفی بکەن و پلەو پایەی هەبێت لەلای نەوەکانی دونیا ، وه نوێژ بۆ مەلیکەکان بکات وه هەروەها نوێژ بۆ خەڵکی نەکات.

هەرکەسێ نەفسی مەیلی هەبێت بۆ ئەو شتانەی که نەهی لێ کراوه دەترسم خۆشی دەنگەکەی ببێته فیتنه بۆی ، کاتێک خۆشی دەنگەکەی سودی پێدەگەینێت ئەگەر له الله بترسێت له پەنهان و ئاشکرادا ، وه مەبەستی بێت که لێیوه قورئان ببیسترێت ، وه ئەهلی بێئاگایان ئاگادار بکاتەوه له بێئاگابونیان ، وه ئارەزوی ئەو شتانه بکات که الله ئارەزومەنده لێی ، وه ئاگاداریان بکاتەوه لەوانەی که نەهی لێ کردون .

هەرکەسێک ئەمه سیفەتی بێت ئەوا بەخۆشی دەنگەکەی سودمەند بووه وه خەڵکیشی پێ سودمەند کردوه .

١١١- له جابرەوە ( رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی:

باشترین و جوانترین دەنگ بۆ قورئان خوێندن دەنگی ئەو کەسەیە کە گوێتان لە خوێندنەوەکەی بوو هەست بکەن کە لە الله دەترسێت ( واتا تەنها مەبەستی کە قورئان خوێندنەکە ڕەزامەندی الله بێت ) .

رونکردنەوە : ابن ماجه ( ١٣٣٩ ) ، وە البوصری ( مصابح الزجاجه ) ( ٦٧٤ ) دەڵێ : ئەمە ضعیفه ، چونکە ابراهیمی کوری اسماعیلی کوری

مجمعی تێدایە سەنەدەکە ، وە عبداللّەی کوری جعفر لە سەنەدەکەیدا هەیە .

١١٢- مرسل لە زوهریەوە ( رحمه الله ) دەفەرمووێ : پێمان گەشتووە کە پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرموویەتی :

باشترین و جوانترین دەنگ بۆ قورئان خوێندن دەنگی ئەو کەسەیە کە گوێتان لە خوێندنەوەکەی بوو هەست بکەن کە لە الله دەترسێت ( واتا تەنها مەبەستی کە قورئان خوێندنەکە ڕەزامەندی الله بێت ) .

محمدی کوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

١١٣- وە رقم لێ دەبێتەوە کە قورئان بخوێنرێت بە لەحن و دەنگی مۆسیقای تێدا بەکار بهێنرێت ، چونکە لای زۆربەی زانایان مەکروهە ، وەکو : یەزیدی کوری هارون ، وە الأصمعی ، وە احمدی کوری حنبل ، وە ابی عبید قاسمی کوری السلام ، وە سوفیانی کوری عیینە ، وە جگە لە یەکێک لە زانایان ( واتا زۆرن ) ، فەرمانیان کردو بە قورئان خوێن کاتێک

قورئان دەخوێنێت با خەمگین بێت ، وە بگریەت ، وە بە دڵی خشوعی هەبێت .

١١٤- عبدالرحمانی کوری سائب ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

سەعدی کوری مالک ( رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ ) هات بۆلامان دوای ئەوەی کە چاوی لەدەست دابوو ، سەلامم لێ کرد ، لە پاڵی دانیشاندم ، دانیشتم بۆی ، فەرمووی : سڵاوت لێبێت ئەی کوری براکەم ، پێم گەشتووە کە تۆ دەنگت خۆشە لە قورئاندا ، گوێم لە پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرموویەتی : ئەم قورئانە دابەزیوە بە خەمەوە ، گەر خوێنتان بگرین ، وە ئەگەر نەیشگریان خۆتان بگریەنن ، دەنگی خۆتان پێی خۆش بکەن ، هەرکەس دەنگی خۆی خۆش نەکات بە قورئان لە ئێمە نیە .

رونکردنەوە : سەنەدەکەی اسماعیلی کوری رافعی تێدایە ضعیفە ( الجرح والتعدیل ٢ / ١٦٨ )

١١٥- لە عبدالرحمانی کوری بریدەوە ، لە باوکیەوە ( رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :

قورئان بخوێنن بە خەمەوە ، چونکە دابەزیوە بە خەمەوە .

١١٦- بە ابن ابی ملیکە وترا : ئەی ئەگەر دەنگی خۆش نەبوو ؟ فەرمووی : تا ئەوەندەی توانای هەیە دەنگی خۆش ئەکات ( بەخۆشی ئەیخوێنێ ).

١١٧- وەکیع و ابن عیینە سەبارەت بەم فەرموودەیە : ( ئەوەی دەنگی خۆی بە قورئان خۆش نەکات ) دەفەرموون : خۆش و جوان خوێندنەوە .

١١٨- وه ڕیوایەت کراوە لە ابو هریرەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) فەرموویەتی : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرموویەتی :

الله تعالى بیستنی بۆ هیچ شتێک ڕانەگرتووە بە ئەندازەی بیستنی بۆ پێغەمبەرێکی دەنگ خۆش کە قورئان ئەڕازێنێتەوە بەدەنگی خۆی و ئاشکرای ئەکات

محمدی کوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

١١٩- پێم خۆشە هەرکەسێک کە قورئان دەخوێنێتەوە ئەوا بە خەمەوە بیخوێنێتەوە ، وە خۆی بگریەنێت ، وە خشوع لە دڵیدا دروست بکات ، وە بیری پەیمانی ڕۆژی دوای بکات بۆ ئەوەی بەهۆی ئەوەوە خەمی بۆ دروست ببێت .

ئایا گوێبیست نەبویت الله عزوجل کەسانێکی وەسف کردوە بەمە ئەوانەی کە ئەم سیفەتەیان هەیە ، وە هەواڵی داوە دەربارەی فەزلیان ، الله عزوجل دەفەرمووێ : ( اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُتَشَابِهًا مَثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ اللَّهِ ) ( الزمر : ٢٣)

( واتا : الله جوانترین فەرمایشتی ناردوەتە خوارەوە قورئانێکە کە ئایەتەکانی لەیەکچوی دووپات کراوەن ئەو کەسانەی لە پەروەردگاریان دەترسن پێستیان تەزوی پێدا دێت بە بیستنی قورئان پاشان پێستیان و دڵیان نەرم دەبێت بە یادی الله )

پاشان زەمی قەومێکی کردوە کە گوێبیستی قورئان بونە و دڵیان خشوعی وەرنەگردوە الله عزوجل دەفەرمووێ : ( أَفَمِنْ هَذَا الْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ ( ٥٩ ) ( وَتَضْحَكُونَ وَلا تَبْكُونَ ( ٦٠ ) ( وَأَنتُمْ سَامِدُونَ ) ( النجم : ٥٩ - ٦٠ - ٦١)

( واتا : جا ئایا لەم وتە کە قورئانە سەرتان دەسورمێ ، وە پێدەکەنن و ناگرین ، وە ئێوە سەرگەرمن )

واتا : بێئاگان .

١٢٠- پاشان پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە قورئان دەخوێنێت وا قورئان بخوێنێت کە چۆن الله عزوجل فەرموویەتی : ( وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلا ) ( المزمل : ٤ ) وتراوە لە تەفسیرەکەیدا : رونی بکاتەوە رونکردنەوەیەکی ئاشکرا ( واتا بە جوانی بیخوێنێت و ددان بە حەرفەکاندا بنێت ).

بزانە ئەگەر خوێندیەوە و رونیکردەوە ئەوا ئەو کەسەی کە گوێبیستی دەبێت سودمەند دەبێت ، وە هەروەها خۆیشی بەوە سودمەند دەبێت . لەبەر ئەوەی خوێندویەتیەوە وەک ئەوەی کە فەرمانی پێ کراوە ( وَقُرْآناً فَرَقْنَاهُ لِتَقْرَأَهُ عَلَى النَّاسِ عَلَى مُكْثٍ ) ( الإسراء : ١٠٦ )

( واتا : وە قورئانمان بەش بەش ناردوە بۆ ئەوەی بیخوێنیتەوە بەسەر خەڵکیدا بەلەسەرخۆی ) ، بە هێمنی .

١٢١- مقسم ( رحمه الله ) دەفەرمووێ : ابن عباس لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا : ( ( وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلا ) ( المزمل : ٤ ) ( واتا : وە دەوری قورئان بکەرەوە بە لەسەرخۆی )

فەرموویەتی : رونی بکاتەوە رونکردنەوەیەکی ئاشکرا ( واتا بە جوانی بیخوێنێت و ددان بە حەرفەکاندا بنێت ) .

١٢٢- عبيد المكتب ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

مجاهد ( رحمه الله ) لە تەفسیری ئەم ئایەدا ( وَقُرْآناً فَرَقْنَاهُ لِتَقْرَأَهُ عَلَى النَّاسِ عَلَى مُكْثٍ ) ( الإسراء : ١٠٦ )

( واتا : وە قورئانمان بەش بەش ناردوە بۆ ئەوەی بیخوێنیتەوە بەسەر خەڵکیدا بەلەسەرخۆی ) .

فەرموویەتی : بە هێمنی .

محمدی کوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

١٢٣- کەمێک لە دەرس خوێندن لە قورئان لەگەڵ تێفکران و ورد بونەوە لام باشترە لەوەی کە زۆر بخوێنیت لە قورئان و بەبێ ئەوەی تێیدا ورد ببیتەوە و تێی نەفکریت تێیدا ، وە رواڵەتی قورئان و سونەت و وتەی زانایان ئاماژە بەوە دەکەن .

١٢٤- ابی جمره الضبعی ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

پرسیارم لە ابن عباس ( رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ) کرد ، وتم : من خێرام لە خوێندنەوەدا : لە سێ شەودا قورئان تەواو دەکەم ، فەرمووی : سورەتی البقرة بخوێنم لە شەوێکدا لێی ورد ببمەوە و بیخوێنمەوە ، لام خۆشترە لەوەی کە بیخویندمەوە وەکو ئەوەی کە دەیلێیت .

١٢٥- عبيد المكتب ( رحمه الله ) دەفەرمووێ:

پرسیار لە مجاهد ( رحمه الله ) کرا دەربارەی پیاوێک کە سورەتی البقرة و ال عمران خوێندوە پیاوێک سورەتی البقرة خوێندوە بە یەک کات تەواویان کردوە ، رکوع و سوجدە و دانیشتنی کامەیان باشترە ؟ فەرمووی : ئەوەی

سورەتی البقرة خوێند ، پاشان فەرمووی : ( وَقُرْآناً فَرَقْنَاهُ لِتَقْرَأَهُ عَلَى النَّاسِ عَلَى مُكْثٍ ) ( الإسراء : ١٠٦ )

( واتا : وە قورئانمان بەش بەش ناردوە بۆ ئەوەی بیخوێنیتەوە بەسەر خەڵکیدا بەلەسەرخۆی ) .

محمدی کوری الحسین ( رحمه الله ) دەفەرمووێ :

هەموو ئەوانەی کە وتم پێویستە لەسەر ئەهلی قورئان کە رەوشتی پێ بگرن لەسەر هەموو ئەو رەوشتە جوانانەی کە هانم دا ، وە بێزار بن لە هەموو ئەو رەوشتە نزمانەی کە بە رقەوە باسم کرد و حەزم لێ نەبوو ، وە الله تەوفیقمان پێ ببخەشیت بە ئێمە و بە ئەوانیش بۆ سەر رێگای راست بە منەت و رێزی الله ، وە ئەو توانای بەسەر هەموو شتێکەوە هەیە ، وە توانای وەڵامدانەوەی هەیە.

**والحمد لله رب العالمين**

**وصلواته على سيدنا محمد النبي وآله الطيبين الطاهرين.**

بحمد الله تم